تۆنی هۆپ

# ڕەوشتی پزیشکی

## پێشەکییەکی زۆر کورت

لە ئینگلیزییەوە: غازی محەمەد



40
زنجیرە کتێبی
ئۆکسفۆرد

سەرچاوەکانی ئەم وەرگێڕانە:
Tony Hope
Medical ethics
A very short introduction
Oxford University press 2004




بڵاوکراوەکانی دەزگای رۆشنبیری
جەمال عیرفان ٢٠٢٢

زنجیرە: (١١٣)

بەڕێوەبەری دەزگا:
سیروان حەمەسەعید حەمەخورشید

Tel: 0533202936 07701549509
email: jamalerfan99@gmail.com
jamal erfan cultural foundation
www. jamalerfan.com

ناونیشان: سلێمانی، شەقامی سالم، بەرامبەر ماکسی مۆڵ

# ڕەوشتی پزیشکی

## پێشەکییەکی زۆر کورت

تۆنی هۆپ

لە ئینگلیزییەوە: غازی محەمەد

زنجیرە کتێبی ئۆکسفۆرد

٤٠



# ڕەوشتی پزیشکی


- نووسەر: تۆنی هۆپ
- وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: غازی محەمەد
- دیزاینی ناوەوە: ئومێد محەمەد
- دیزاینی بەرگ: ئارام عەلی
- نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم: ٢٠٢٢
- تیراژ: ٥٠٠ دانە
- نرخ: ٥٠٠٠ دینار
- چاپ: چاپخانەی تاران

# پێڕست

# پرۆژەی وەرگێڕانی زنجیرە کتێبەکانی
# زانکۆی ئۆکسفۆرد

زیاتر لە ٢٥ ساڵ بەر لە ئێستا، ساڵی ١٩٩٥، زانکۆی ئۆکسفۆرد، کە دامەزراوەیەکی دیاری دنیای ئەکادیمی و جیهانە بە گشتی، دەستی بە پرۆژەیەکی گرنگ کرد. پرۆژەکە پێکهاتووە لە زنجیرە کتێبێکی کورت و پوخت و زانستی لە تەواوی بوارە جیاوازەکاندا: لە پرسی تیرۆرەوە بۆ کەشوهەوا، ئابووری کۆن و نوێ و پرسی جیهانگیری. لە فەلسەفەی پێش سوکراتەوە بۆ مۆدێرن و پۆست‌مۆدێرن. لە مێژووی کاتەوە بۆ مێژووی جیهان، لە فیزیکی کۆنەوە بۆ کوانتەم و دنیای دیجیتاڵ و ئایندەی مرۆڤ. لە بوونناسیەوە بۆ ئاییناسی و مێژووی ئایینەکان و پرسی ئیسلام و ئەندازیاری و ماتماتیک. لە ئەفسانەناسییەوە بۆ ئەدەبناسی و تیۆر و ڕەخنەی ئەدەبی... پرۆژەکە خۆی بە یەک بوارەوە نەبەستۆتەوە، بەڵکو دەستی بۆ تەواوی بوارە جیاوازەکان بردووە، ئەمەش لە بێ پلانی و هەڕەمەکییەوە نییە، چونکە بێ پلانی لە زانکۆیەکی پلانسازی وەک ئۆکسفۆرد ناوەشێتەوە.

سروشتی ئەم زنجیرە کتێبانە، بریتییە لە زانستیبوون، کورتی و پوختی و چڕی و ئێستاییبوون، کە هەموو کتێبەکان لەلایەن کەسانی پسپۆر و شارەزای بوارەکان لەسەر ئاستی جیهان نووسراون. خوێنەر کاتێک بەر هەر بەرهەمێک لەم پرۆژەیە دەکەوێت، دەزانێت چەند هارمۆنی و سادەقووڵ نووسراون. خاڵێکی درەوشاوەتر، بریتییە لە خوێندنەوە و شیکاری ڕووداوەکانی هەنوکە، واتە کتێبەکان تەنیا هۆنینەوەی چیرۆکی ڕابردوو نین، بەڵکو شیکاری دۆخی ئێستای جیهان و مرۆڤ دەکەن.

ئۆکسفۆرد لە ١٩٩٥ تا ٢٠١٨ زیاتر لە ٦٠٠ کتێبی لەم زنجیرەیە بڵاوکردۆتەوە؛ سەرەتای هەر مانگێک کتێبێکی نوێیان بڵاوکردۆتەوە. بەهۆی بایەخی نەبڕاوەی پرۆژەکەوە، زنجیرە کتێبەکان بۆ زیاتر لە ٢٥ زمانی دنیا وەرگێڕاون، وا ئێستا زمانی کوردیش دەیەوێت ببێتە یەکێک لەو زمانانەی ئەم پرۆژەیە لە ئامێز دەگرێت. دەستبردن بۆ وەرگێڕان و لە ئەستۆگرتنی ئەم کارە، بەرپرسیارێتییەکی مێژوویی و ئەکادیمی گرنگە، کە دەزگای جەمال عیرفان بە سپۆنسەری (د. تەها ڕەسوڵ) ئەنجامی دەدەن. وابڕیارە هەر سێ مانگ جارێک ١٠ بۆ ١٥ کتێب لە زمانی یەکەمەوە لە ڕێگەی وەرگێڕی شارەزاوە بڵاوبکاتەوە. ئەمە پرۆژەیە و پرۆژەش بە دڵنیاییەوە قۆناخێکی مێژوویی لە بزاڤی ڕۆشنبیری و کتێبخانەی کوردیدا بۆ خۆی دروستدەکات، بەهیوایین ببێتە داینەمۆی دروستکردنی نەوەیەکی نوێی بەرپرسیار و هۆشیار.

**سەرپەرشتیاری پرۆژە**
**هەرێم عوسمان**

## پێشەکییەکی زۆر کورت

بۆ هەریەکێک بییەوێت بە ڕێگەیەکی سووک و ئاسان دەستی بگاتە هەر بابەتێکی نوێ، ئەوا دەتوانێت، ئەو بابەتانە بەدەستبێنێت کە لەلایەن پسپۆرانی تایبەتەوە نووسراون و بۆ زیاتر لە ٢٥ زمان لەتەواوی جیهاندا بڵاوکراونەتەوە.

لە ساڵی ١٩٩٥ەوە ئەم زنجیرە کتێبە بڵاو دەکرێتەوە، خۆی لە کۆمەڵێک بەرهەمی هەمەڕەنگدا دەبینێتەوە لە بابەتەکانی مێژوو، فەلسەفە، ئاین، زانست و زانستی مرۆڤایەتی. ئەم کتێبەی لەبەردەستدایە، یەکێکە لە بەرهەمەکانی ئەو زنجیرەیە، لە ساڵی ٢٠٠٤ بڵاوکراوەتەوە. لەپێشەکیی ئەو چاپەدا هاتووە: لەماوەی چەند ساڵی ئایندەدا ئەم پرۆژەیە گەشە دەکات بۆ کتێبخانەیەک کە سەدان کتێب لەخۆ دەگرێت- پێشەکییەکی کورت بۆ هەر شتێک، لە میسری کۆن و فەلسەفەی هیندییەوە دەستپێدەکات تا دەگاتە هونەری خەیاڵ conceptual و گەردووناسی.

# بەشی یەکەم
# بۆچی ڕەوشتی پزیشکی هەژێنەرە

« من ئەوەندە کاتم نییە بیر لە شتەکان بکەمەوە» کاتێ ئەمەی گوت چمکی داکۆکی لەخۆکردنێک لە تۆنی دەنگی دەخشا «من لە نێو سەدان و هەزاران کەسدا بەشداریی ژیان دەکەم. فەلسەفە بۆ سەرخۆشەکان بە جێدێڵم».

خاوەنی کوشکی ئایس کریم- ئەبریستیۆس مۆن ئامور

ڕەوشتی پزیشکی، لە نێوان پلان دارێژەرو جێبەجێ کاردا، لە نێوان فەیلەسوف و ئەنجامدەردا، بە هەوەس و خووی جیاواز خۆی نمایش دەکات: ئەمەش پەیوەندیی بە چەند پرسیارێکی مۆراڵیی گەورەوە هەیە: بۆنموونە **مەرگی ئاسان و کوشتنی بە ڕەوشتانە**یە. ئەم دۆخە بەرەو جیهانی فەلسەفەی سیاسی دەمانبات. پێویستە چۆن سەرچاوەکانی چاودێریی تەندروستیی پێویست دابەش بکەین، پرۆسەی

بڕیاردانەکە چۆنە؟ پەیوەندی بە مەسەلە یاساییەکانەوە هەیە؟ ئایا مەرگی ئاسان سەبارەت بە پزیشکەکە بە تاوان دادەنرێت، یان نا؟ چی کاتێک دەتوانرێت نەخۆشی دەروونی بەبێ ویستی نەخۆشەکە خۆی چارەسەر بکرێت؟ ئەمەش بەرەو مەسەلە جیهانییە گەورەکە دەمانبات کە پەیوەستە بە پەیوەندیی ڕاستەقینەی نێوان وڵاتە دەوڵەمەند و هەژارنشینەکانەوە.

زانستی پزیشکیی نوێ، بژاردەی مۆراڵی نوێی هێناوەتە کایەوە، بەرهەڵستیی هەموو ئەو بۆچوونە کۆنانە دەکات کە ئێمە سەبارەت بەخۆمان هەمانە. بیرۆکەی بەرهەمهێنانی چەند فیلمێک سەبارەت بەو مەسەلەیە لە خەیاڵی زانستیدا بەرجەستەکردووە. توانای دروستکردنی کۆپیی مرۆڤ و گیانەوەران بە دوور نازانرێت. تەکنۆلۆجیای دروستکردنی کۆرپەلە (بلووری)، زۆر بە ڕاشکاوی ئەو پرسیارە دەخاتە بەرباس کە لە بەرژەوەندیی ئەوانەدایە کە هێشتا لە دایک نەبوون- و ڕەنگە بوونیان نەبووبێت. ئەم پرسیارە بەرەو دەرەوەی کردەی پزیشکی دەمانبات و دوورمان دەخاتەوە، لەو بەرپرسیارێتییەی بەرامبەر ئایندەی مرۆڤایەتی دەیگرینە ئەستۆ.

مەودای ڕەوشتە پزیشکییەکان لە میتافیزیکەوە درێژدەبێتەوە بۆ دونیای پراکتیک. نەک هەر گرنگیی بە کێشە گەورەکان دەدات، بەڵکو گرنگی بە کاری پراکتیکی ڕۆژانەش دەدات لە پیشەی پزیشکیدا. پزیشکەکان سەر گەرمی ژیانی ڕۆژانەی خەڵکن، ژیانی ئاساییش پڕە لە کێشەی ئەخلاقی. ژنێکی بە تەمەن جگە لەوەی بڕێک لە نەخۆشیی خلەفانی لەگەڵە، بەدەست نەخۆشییەکی

گرانیشـەوە دەنـاڵێنێ کە ژیـانی لـێ تـاڵ کـردووە. ئایـا بەو هەمـوو داودەرمـان وتوانـاو تەکنۆلۆجیـایەی لەبەردەسـتایە دەکرێ لە نەخۆشخانە چارەسەر بکرێ، یان دەبێ لە کونجی ماڵەوە پشوو بدات؟ ڕەنگە خێزانەکە بەمە ڕازی نەبن. ڕەنگە ئەم کەیسـە کەیسـێکی ئەوتـۆ نەبێـت ببێـتە مانشـێتی ڕۆژنامەکـان؛ بەڵام وەکـو مامۆسـتایانی دێرینـی هـونەر لەسەردەمی ڕینیسانسدا دەرکیان پێکردووە، شتە ڕۆتین و گـرنگەکەی زۆربەی ژیـانی ئـێمە، لە زۆربەی کاتەکانـدا، ڕەوشتناسییە لە بواری پزیشکیدا، پێویستە ئامادەبین لەگەڵ تیـۆردا ڕەفتـار بکەیـن، کـات لەبەکارهێنـانی خەیـاڵ و پێشـبینییەکاندا خەرج بکەیـن. بەڵام دەبـێ لایەنە پراکتیکییەکـانیش پشـتگوێ نەخەیـن: بتـوانین پێڕەوێکـی بێ فرتوفێڵ و دوور لە لووتبەرزی بگرینە بەر.

سەرەتا لە ڕووی تیۆرییەوە گرنگیی تایبەتم بە ڕەوشتی پزیشـکی دەدا، کاتێـک خەریکـی پلەیەکـی خوێنـدن بـووم کە ئەویـش فەلسـەفە بـوو، بەڵام کاتێـک پەیوەنـدیم بە کـۆلێژی پزیشـکییەوە کـرد، زیـاتر بە لای لایەنە پـراکتیکییەکەدا بامـدایەوە. چـونکە پێویسـتم بە بڕیـاردان بـوو، دەبـوایە یارمەتیی مەیدانیی نەخۆش بدەم، وەکو پزیشکێکی دەروونی psychiatrist خەریکی ڕاهێنان بووم، بابەتی ڕەوشتناسـی لە گۆشـە پراکتیکییەکـانی ژیـانی منـدا وەکـو پزیشـکێک لە جیهـانی کلینیکـدا زۆر کـاڵبووەوە. لەگەڵ گەشـە کردنـی ئەزمـونی نێو قاوشـەکاندا، زیاتر هەستم بەوە دەکرد، بەها مۆراڵییەکـان خۆیـان لە هەنـاوو نـاخی پزیشـکیدان. بـۆ بڕیـاردان لەسـەر کەیسـە کلینیکییەکـان لە ئەنجـامی مەشـقی پزیشـکیدا زیـاتر تەرکیـزم خسـتبووە سـەر گرنگیـی

بەکارهێنــانی بەڵــگەی زانســـتی. زۆر بیــرم لەو پاســاوو بیانووانە نەدەکردەوە، کە پەیوەندی بە ڕەوشتی پزیشکییەوە بوو. تەنانەت تێبینیی ئەو ئەگەرە ئەخلاقییانەم نەدەکرد کە لە پشــتی بڕیارەکــانەوە ســەرهەڵدەدەن. بەڵام دواتــر بەرە بەرە، هەســتم بەوەکــرد بەرەو ڕەوشتناســی لە پیشــەی پزیشکیدا هەنگاوم دەنێم، دەمویست لە ڕێگەی نەخۆش و ڕاهێنــانی پزیشــکییەوە، ســوود لە ڕەوشتناســی وەربگــرم. وەکو وتم من زۆر چێژم لە بواری تیۆری دەبینی، حەزم لێبوو بە ئاراستەی گشتی و ئەبستراکتدا هەنگاو هەڵێنم؛ بەڵام ئێستا دەبینم پراکتیک شتێکی ترەو زۆر جیاوازە.



(وێنەی ١). ڕەوشتی پزیشکی، پەیوەندیی بە جووتیارەکەو ئیکارۆسەوە (قاچەکانی بە حەوارە خەریکە نقووم دەبێت).
Brugel, Icarus (1555)

بۆ نموونە لە کێشەی نەبوونی شوناسنامەدا، لە کێڵگەی مینی فەلسەفیدا گفتوگۆم دەکرد (بەشی ٤)، چونکە پێموابوو، مەسەلەکە پەیوەستە بەو بڕیارانەوە کە پێویستە لەسەر پزیشکان و کۆمەڵگە پێیکەوە بیدەن. فەیلەسووف و بیرمەندی مێژوویی، ئیشعیا بێرلن، دەسپێکێکی سادەو سانای سەبارەت بە تۆڵستۆی لە ڕێگەی وتەیەکی شاعیری یۆنانی ئەرخیلۆخۆسەوە نووسیوە:

«ڕێوی زۆر شت دەزانێت، بەڵام ژیشک یەک شت دەزانێ، بەڵام یەک شتی گەورە».بێرلن بە شێوازێکی میتافۆری، ئاماژە بەو جیاوازییەی نێوان ڕێوی و ژیشک دەدات، ڕەنگە بەو مەبەستە بێت " قووڵترین جیاوازی بخاتە نێوان نووسەرو بیرمەندان، و ڕەنگە لە نێوان مرۆڤ بەشێوەیەکی گشتی"، ژیشک نموونەی ئەو کەسانەیە، هەموو شتەکان بە دیدێکی سێنتراڵەوە چاو لێدەکەن،

*تاک سیستەمن، زیاتر یان کەمتر پەیوەستن، یان ڕاشکاوانە ترن لە شێوازی دەربڕین، تێگەیشتن، بیرکردنەوەو هەستکردندا- پرەنسیپێکی تاک ڕەهەند و جیهانییان هەیە، ئەوەی ئەوان دەیڵێن گرنگیی خۆی هەیە.*

**نوێنەرایەتیی ڕێوی**

*ڕێوی.. نوێنەرایەتیی ئەو کەسانە دەکات، بە دوای مەبەست و ئامانجی هەمەچەشنەدا وێڵن، زۆرجار ئەو ئامانجانە نەک هەر پەیوەندییان بە یەکەوە نییە، بەڵکو دژو ناکۆکن، ئەگەر لە ڕووی دیفاکتۆوە پەیوەستیش بوون، ئەو بیرۆکانە هەڵدەبژێرن یان بەو کارانە ئاسوودەن کە دوورن لە ناوەندێتی و سێنتراڵەوە، ئەزموونە گەورەو جیاوازەکان*

*پێکەوە گرێدەدەن، بێئەوەی هەوڵی ئەوە بدەن لە گەلیاندا دەگونجی یان نا.* بێرلن، نموونەی لەسەر ژیشک هێناوەتەوە: دانتی، ئەفلاتون، دۆستیۆفسکی، هیگڵ، برۆست. لە نموونەی ڕێویش: شەکسپیر، هیرۆدۆتس، ئەرستۆ، دی مۆنتین، و جۆیسن. بێرلن بەردەوام دەبێ و دەڵێت: تۆلستۆی بە سروشتی خۆی ڕێوی بوو، بەڵام باوەڕی بەوە هێناوە ژیشکە.





(وێنەی ٢). تۆ کامیانی ژیشک یان ڕێوی؟

من خۆشم ڕێویم یان بەلای کەمەوە دەمەوێ ڕێوی بم، مـــن سەرســـامم بە زرنگـــی و وردبینـــی ئەوانەی هەوڵـــی دروســـتکردنی دیـــدێکی هـــاوبەش دەدەن، بەڵام وا بەبـــاش دەزانـم دیدێک بێت دەوڵەمەند بە دژبەیەکی، هەندێجار دەمەوێ دیدی ڕێوییەکانی بێرلن لێڵ و ناڕوون و تێکدەرانە بن بەڵام نامەوێ لەم کتێبەدا خۆم بخزێنمە نێو کێشە فرە ڕەهەنـــدەکانەوە، بەڵکـــو دەمەوێ لە ڕێـــگەی یەک تیـــۆریی ئەخلاقییەوە لەسەریان بدوێم. هەر بەشێک لەم کتێبە کە من گفتوگۆی لەسەر دەکەم، وەکو مەسەلەیەک لێی دەڕوانرێت کە زۆر تـــایبەتە، میتـــۆدی گفتوگۆکـــانم وا دەردەکەون زۆر پەیوەســـتن بەو بـــابەتەوە کە لەســـەری دەدوێـــم. بـــواری هەمەچەشنەم هەڵبژاردووە لە بەشی جیاواز لەیەکتریدا، هەر یەکەی بەجیا ڕووماڵیان دەکەم، لەوانە: بۆماوەزانی، تەکنیکە نوێیەکـــانی منـــداڵبوون، تەرخـــانکردنی پـــارە، تەندروســـتی دەروونـی، لێکۆڵینەوەی پزیشکی، ...تاد؛ لە هەر بوارێک لەم بوارە تازانەدا ڕەچاوی یەک مەسەلە کراوە.

لە کۆتـایی کتێـبەکەدا، ڕێنمـایی خـوێنەرم کـردووە بـۆ مەسەلەی ترو خوێندنەوەی تر. ئەوەی لە هەموو بەشـەکاندا هـــاوبەش و بەرچـــاوە، بە ناوەنـــدکردنی بیرکـــردنەوەو مـاقوڵییەتی بابەتەکـانە. مـن پێمـوایە ڕەوشـتی پزیشـکی لە بنچیـــنەوە بـــابەتێکی ئەقڵانیـــیە: واتە مەســـەلەکە هەمـــووی پەیوەســتە بەو بڕوبیـانووانەوە دەبێـتە هـۆی، سـەرهەڵدانی ڕاوبۆچوونی تۆ، بە هەمان شێوە لەسەر بنەمای هۆکارەکان خـۆت ئامـادە دەکەیـت بـۆ گۆڕانکـاری لە ڕاوبۆچوونەکانـت، هەر لەبەر ئەوەشـــە یەکێـــک لەبەشـــەکان، لە ناوەڕاســـتی کتێـبەکە، ڕەنگـدانەوەی ئـامرازە جیاوازەکـانی مشـتومڕی

ئەقڵانیـــیە. بەڵام لەگەڵ ئەوەی مـــن بـــاوەڕم بە گرنگیـــی مەرکەزییەتـــی هۆکـــار و بەڵگەکـــانە، بەڵام ئەو ڕێـــوییەی لە نـاخی منـدایە، هاوشـێوەی هەڕەشـەو ئاگـادار کـردنەوەیەکە. بیرکـردنەوەی ڕوون و پێـوەرە باڵاکـانی ئەقڵانیـیەت تێیـدا بەس نـین. ئێمە پێویـستمان بە گەشـەپێدانی دڵ و لە هەمـان کاتـدا ئەقڵیشـمانە. ڕەنـگە ڕێکخسـتن و پەروەردەی ئەخلاقـی بەرەو کـاری خـراپ و بڕیـاردانی هەڵەمـان ببـات، ئەگەر شـــوێنکەوتەی هەســـتیارییە ڕاســـتەقینەکان نەبـــووین.

ڕۆماننووس زادی سمیس دەنووسێ:

*لە ڕۆمـانی کۆمیدی ئینگلیزیدا هـیچ تاوانێک لەوە گەورە تـر نییە، بـاوەڕت وابـێ تـۆ لەسـەر حەقـی. ئەو پەنـدەی لە ڕۆمـانی کۆمیدیدا سـوودمان لێبینیـوە، لەوەدایە پەروەردەیمان بـۆ ئەخـلاق وای لێکـردووین، ڕەق بـین، یەک لا بـین، سـاف بین.*

ئەم وانەیە پێویســـتە بخـــرێتە هەر بوارێـــک لە بـــواری ڕەوشتە پراکتیکییەکانەوە لەوانە ڕەوشتی پیشەی پزیشکی.

باشـترین شـوێن بـۆ دەسـتپێکی ئەم گەشـتی ڕەوشـتە پزیشکییە کامەیە جگە لەو شـوێنەی لەگەڵ کێشـە ئاڵۆزەکەدا یەکانگیر دەبێت ئەویش مردنی ئاسانە؟

# بەشی دووەم

# مەرگی ئاسان: پراکتیکی پیشەی پزیشکیی ئەرێنییە، یان تاوانی کوشتنە؟

*کردەوەی باش پێویستی بە ڕوونکردنەوەی زۆر نییە، بەڵام کاتێک کارێکی نەگریس ئەنجام دەدرێت، هونەری ڕەوانبێژی بە تەواوی تێدا بەکاردێت، مەبەست لەو ڕەوانبێژییە پەردەپۆش کردنی ئەو کارە نەگریسەیە.*

*سیوسیدیدیس*[1]

1 Thucydides

پراکتیزەکردنی مەرگی ئاسان، ڕێک پێچەوانەی ئەو نەریتەیە کە زۆر لە کۆنەوە ڕێزی لێ گیراوە کە دەڵێ: " مەکوژە، کوشتن گوناهە ". بەڵام لە ژێر قورسایی هەندێ لە هەلومەرجەکاندا، کوشتنی بەبەزەیی بەپێی دوو پرەنسیپی مۆراڵی ڕێگە پێدراو، لە پیشەی پزیشکیدا ڕێزی لێگیراوە:

**پوختەی پێداویستییەکانی کوشتنی ئاسان بە پێی مەرجەکانی یاسای هۆڵەندی**

**١- ئایندەی نەخۆشەکە توانای بەرگەگرتنی ئەو ئازار و ژانەی نەبێت کە بە دەستییەوە دەناڵێنێ.**
**٢-داواکردنی مردن خۆبەخشانە بێت و پێشتر بە باشی لێی کۆڵرابێتەوە.**
**٣-پێویستە پزیشک و نەخۆش هەردووکیان گەیشتبنە ئەو باوەڕەی هیچ چارەسەرێکی تریان لەبەردەمدا نییە.**
**٤-ئەو مردنە وا پێویست دەکات ڕای پزیشکی دووەمیشی لەسەر بێت، دەبێ کۆتایی هێنان بە ژیانی نەخۆشەکە بە ڕێگەی پزیشکیی گونجاو بێت.**

ئەو دوو پرەنسیپەش، سەربەخۆیی بڕیاردانی نەخۆش، لەگەڵ لە بەرچاوگرتنی بەرژەوەندییە باڵاکانی نەخۆشەکەیە.

لە سویسراو ویلایەتی ئەریگۆنی ئەمەریکا خۆکوشتنی نەخۆش بە یارمەتی پزیشک دەبێت، ئەمەش ئامۆزای کوشتنی ئاسانە، ئەگەر لە ڕووی یاساییەوە مەرجەکان هاوشێوەبن. لە سەد ساڵی دواییدا سێجار لە کۆشکی

لـۆردانی بەریتانیـا پـرۆژەی ئامـادەکراو بـۆ لێکـۆڵینەوە، سەبارەت بە یاسایی کردنی *کوشتنی ئاسان* خرایە بەرباس، بەڵام لە هەر سـێ بـۆنەکەدا ئەم پـرۆژەیە ڕەت کـرایەوە. کـۆمەڵەی زۆر لە جیهانـدا بە مەبەسـتی *کوشـتنی ئاسـان و خۆبەخش* دامەزران، ئەندامێکی زۆریان بۆ خۆیان ڕاکێشا.

**گەمە کردن بە کارتی نازییەت**

ئەو هەراوزەنـایەی دژی کوشـتنی خـۆبەخش، بـووە شتێکی باو، ناڕەوا بوو، من ناوم نا " گەمە کردن بە کارتی نـازییەت" چـونکە دژبەرانـی کوشـتنەکە پشـتیوانانی کوشتنەکەیان بەم کارتە تاوانبار دەکرد: «ڕاو بۆچوونەکانت هاوشێوەی ڕاوبۆچوونی نازییەکانە»، بە کورتی دەرەنجامی ئەم لێدوانە ڕەوانبێژییە، دژ بە پشتوانانی کوشتنی خۆبەخش ئەوەی ڕوون دەکردەوە: «ڕاوبۆچوونەکانتان سەرتاسەر بێ ڕەوشتانەیە».

ڕێگەم بدەن با ئەم گفتوگۆیە بخەمە چوارچێوەی فۆرمی فەلسـەفەی کلاسـیکەوە، کە ناسـراوە بە پێـوەری لۆجیـک Syllogism ( دەمەوێ لە بەشـی پێنجەمـدا زیـاتر لێـی بدوێم):

ئەگەری ١: زۆربەی ئەو ڕاوبۆچوونـانەی نازییەکـان هەیانبوو، بە تەواوی دوور بوو <u>لە ڕەوشتەوە</u>.

ئەگەری٢: ڕاوبۆچوونت ( بۆ پشتیوانی کوشتنی ئاسان لە ژێر هەندێ هەلومەرجدا)، <u>ڕاوبۆچوونی نازییەکانە</u>.

**ئەنجام: ڕاوبۆچوونت تەواو بێ ڕەوشتانەیە.**

ئەم ئەگەرە، ئەگەرێکی ڕەوا نییە. تەنها ئەو کاتە دەبێتە ئەگەرێکی ڕەوا ئەگەر تەواوی ئەو ڕاوبۆچوونەی نازییەکان

هەڵیــان گرتــووە، بــێ ڕەوشــتانە بێــت. بــۆیە ئەگەری ١ دەگۆڕمەوە بە ئەگەری ١ *. بەم شێوەیەی لای خوارەوە:

هەموو ئەو ڕاو بۆچوونانەی نازییەکان هەڵیان گرتووە بێ ڕەوشتانەیە. لەم دۆخەدا ئەگەرەکە لە ڕووی لۆجیکەوە ڕەوایە. بەڵام بۆ ئەوەی بزانین ئەگەرەکە ڕەوایە، پێویستە هەڵسەنگاندن بۆ باوەڕی ١* بکەین.

لێرەدا دوو لێکدانەوە بۆ وەڵامی ١* هەیە. یەکێ لە لێکدانەوەکان کۆپییەکی وەڵامی ناڕاستی کلاسیکییە (هەڵەی هاوڕێتیی خراپ): ئەمە بیرێکی تایبەتی ڕاست یان هەڵەیە، نەک بە هۆی پشتگیری کردن یان بەرهەڵستی کردنی ڕاوبۆچوونەوە، بەڵکو بەهۆی چاکەی حەقیقەتی ئەو کەسە تایبەتە، یان گرووپەی ئەو ڕایەی هەڵگرتووە بڕوانە (warburton, 1996)، بەڵام خەڵکی خراپ ڕەنگە ڕاوبۆچوونی باشی پێ بێت و خەڵکی باشیش دەکرێ، چەند ڕاو بۆچوونێکی خراپی لە خۆیدا هەڵگرتبێ. دەکرێ یەکێ لە گەورە پیاوانی نازی لە ڕووی ڕەوشتییەوە ڕووەکی بێت. ئەم ڕاستییە پەیوەندی نییە بە مەسەلەی ئەوەی ئایا بنەمای ئەخلاقی لە بەرژەوەندی ڕووەکخۆرەکان هەیە یان نا. ئەوەی گرنگە هۆکارەکانی ڕای دیاریکراوو بەرهەڵستی کردنی ڕای کەسەکەیە نەک کەسەکە خۆی، زۆر بە باشی ڤیجتەریانیزمی هیتلەر[٢]، لەسەر بنەمای تەندروستی ناسراوە نەک ئەخلاقی (Colin Spencer, 1996) .

---

2 Vegetarianism

-بەکەسێکی ڕووەکی دەوترێ، لە دوادواییەکانی ژیانیدا ئەدۆلف هیتلەر (١٨٨٩-١٩٤٥) سیستەمێکی خۆراکیی ڕووەکی پێڕەوکرد. هێشتا ڕوون نییە

بەڵام لێکدانەوەکەی تر کە زیاتر موژدەبەخشە نکە ڕاو بوچوونی نازی کە ئاماژەی پێدراوە، کۆمەڵێ ڕاوبۆچوونی پەیوەندیدارە، هەر هەمووشیان ڕاوبۆچوونی نائەخلاقین، پشتبەستوون بە ڕاسیزم، باوەڕیان بە کوشتنی خەڵک هەیە «پێچەوانەی ویستی خۆیان» و دژی بەرژەوەندییەکانیان کاردەکەن. ئابەمجۆرە، کاتێک دەوترێ کوشتنی ئاسان ڕاوبۆچوونێکی نازییانەیە، مەبەست لەوەیە یەکێ لە ڕاوبۆچوونە بنەڕەتییەکان بێڕەوشتانەیە، لە دیدو جیهانبینیی نازییەتی بێڕەوشتەوە. کێشەی ئەم مشتومڕە لەوەدایە زۆربەی ئەوانەی پشتیوانی لە کوشتنی ئاسان و خۆبەخش دەکەن- وەکو ئەوەی لە هۆڵەندا پراکتیزە دەکرێت بۆنموونە، دژی دیدو بۆچوونی نازییەتن لە جیهاندا. بەڵکو تەواو بە پێچەوانەوە، هەردوو لایەنی مشتومڕەکە سەبارەت بە کوشتنی ئاسان، لەوەدا کۆک و تەبان، ئەو کوشتنەی نازییەکان ئەنجامیان داوە، لە ژێر پەردەی کوشتنی بەبەزەیی، بە ئاشکرا بێ ڕەوشتانەبووە. ئێستا پرسیارەکە ئەوەیە کوشتنی بەبەزەیی لە ژێر هەر بروبیانوویەکدا بێت، ڕاستە یان هەڵەیە، ئەخلاقییە یان نا ئەخلاقی، هەموو ئەمانە دەوەستێتە سەر ئەوەی لەم دۆخە دیاریکراوانەدا مەبەست لە کوشتنی ئاسان ڕوون و ورد بێت، تەنها ئەو کاتە

---

بۆچی ئەو سیستەمەی هەڵبژارد، بەڵام گێرانەوەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە، پێش بەرپابوونی جەنگی جیهانیی دووەم، هیتلەر گۆشتخۆربووە. لە کۆتایی ساڵی ١٩٣٧ دوکتورەکان سیستەمێکی خۆراکییان بۆی دانا خاڵی بوو لە گۆشت، خەڵکی عەوام وایاندەزانی کە هیتلەر خۆی کەسێکی ڕووەکخۆرە.(وەرگێڕ)

دەتوانیت لایەنگرو نەیارەکانی گفتوگۆکە، بەشێوەیەکی ڕاست و دروست هەڵسەنگێنیت. ئەوەی پێویستمانە هەندێ بەرچاو ڕوونییە لە کەیسەکەدا.



(وێنەی ٣). ئەوکەسانەی بەرهەڵستی کوشتنی ئاسان دەکەن زۆرجار گەمە بە کارتی نازییەت دەکەن.

## ڕوونکردنەوەی چەمکی دیبەیتەکان
## سەبارەت بە کوشتنی ئاسان

سەبارەت بە کوشتنی ئاسان لە ( لاپەڕەی داهاتوو) دا چەند پێناسەیەکمان کردووە. ئەویش بۆ دوو مەبەست، لەلایەک بۆ جیاکردنەوەی جۆرەکانی کوشتنی ئاسان لە یەکتری، لەلایەکی ترەوە بۆ فێربوونی زاراوەی وردونوێ. زۆرجار ئەم وردەکارییانە لە هەڵسەنگاندنی هۆکار و ئەرگیۆمێنتەکاندا گرنگیی خۆیان هەیە. ئەگەر لە خاڵێکدا وشەیەک بە مانایەک بەکار هێنرا، لە خاڵێکی تری گفتوگۆکەدا وشەیەکی تر بە مانایەکی تر بەکار هێنرا، ئەوا ئەو مانایە دروستە، بەڵام لە ڕاستیدا بەو جۆرە نییە.

ئەگەر لەم پێناسانەمان کۆڵییەوە، یەکسەر هەست دەکەین گەمە کردن بە کارتی نازییەت، چەند جیاوازییەکی گرنگی تێپەڕاندووە. خاڵی یەکەم بەلای کەمەوە کە من دەمەوێ ئاماژەی پێ بکەم ئەوەیە، کوشتنی ئاسان ئاماژەیە بۆ سوودو بەرژەوەندی کەسەکە، بەڵام ئەوەی نازییەکان ئەنجامیانداوە هیچ ئەرزشێکیان بۆ کەسە کوژراوەکە دانەناوە، ڕەچاوی هیچ سوودو بەرژەوەندییەکی کوژراوەکەیان نەکردووە.

خاڵی دووەمی کوشتنەکە، دەکرێ خۆبەخشانەو بە خواستی کەسەکە خۆی بێت، بێ خواستی خۆی بێت، یان دژی خواستی خۆی بێت. خاڵی سێیەمی کوشتنەکە ڕەنگە بە شێوازێکی ئەکتیڤ و خێرا بێت، یان بەشێوازی تەمەڵ و سست و لەسەرەخۆ بێت.

**خۆکوشتن و کوشتنی ئاسان: چەند زاراوەیەک**

euthanasia لە وشەی گریکی eu thanatos ەوە هاتووە، واتە مەرگی باش، یان مەرگی ئاسان.

مەرگی ئاسان: (س) بە ئەنقەست (ی) دەکووژێت. یان ڕێگە بە کوشتنی (ی) دەدات، لە بەرژەوەندیی (ی).
مەرگی ئاسانی چالاک: (س) کارێک ئەنجام دەدات، ئەنجامەکەی دەبێتە هۆی مردنی ( ی).
مەرگی ئاسانی سست: (س) ڕێگەدەدات بە کوشتنی (ی) بەشێوازێک ئەو چارەسەرو دەرمانەی تەمەنی (ی) درێژ دەکاتەوە (س) لێی دەبڕێت.
مەرگی ئاسانی خۆبەخشانە: کاتێ (ی) لەسەر داوای خۆی دەیەوێ بمرێ، واتە کەسێکی پێگەیشتووە، ئامادەیە بۆ مردن.
مەرگی ئاسانی ناخۆبەخشانە: کاتێ (ی) توانای ئەوەی نییە گوزارشت لە بەرژەوەندیی خۆی بکات، بۆنموونە، کۆرپەیەکی زۆر بێ دەسەلات، لەلایەن (س)ەوە ئەنجامدەدرێت.
مەرگی ئاسانی بێ خواست: سەپاندنی مەرگ بە بێ ویست و خواستی (ی)، بەلام دواجار ئەم جۆرە مردنە لە بەرژەوەندیی (ی) دایە، لە لایەن (س) ەوە، ئەنجام دەدرێت.
خۆکوشتن: (ی) بە ویستی خۆی، خۆی دەکوژێت.
یارمەتیدەری خۆکوشتن: (س) بە خواستی هەردوولا یارمەتی (ی) دەدات خۆی بکوژێت.
یارمەتی پزیشکیی بۆ خۆ کوشتن : بە ئەنقەست (س) کە پزیشکێکە خۆویستانە یارمەتی (ی) دەدات خۆی بکوژێت.

سەرچاوە
( Adopted from tony hope, J. Savulescu, and J. Hendrick, Medical Ethics and law: The Core Curriculum(Churchill livingstone, 2003).

**بەرژەوەندی باڵای نەخۆش**

دەکرێ مردن باشترین بژاردەبێت بۆ نەخۆش ؟ من باوەڕم وایە بەڵێ دەبێت. دادگاکان باوەڕیان وایە دەبێت، زۆربەی پزیشک و پەرستارەکان باوەڕیان وایە دەبێت، کەسە نزیکەکان باوەڕیان وایە دەبێت. لە بواری چاودێریی تەندروستیدا هەمیشە ئەم پرسیارە بەهێمنی دەکرێت، کاتێک دەردی نەخۆشێک بێ دەرمانە، گیرۆدەی نەخۆشییەکی کوشندەیە ، لەقۆناغێکدایە ڕۆژێک یان دوو ڕۆژی تر دەمرێ، بەڵام لە ڕێگەی چارەسەری بەهێزەوە وایان لێکردووە چەند هەفتەیەک زیاتر بژی، بەتایبەتی ئەو نەخۆشانەی کە میکرۆبی هەوکردنی سییەکان لە لەشیاندا تەشەنەی کردووە، یان تووشی ژاراوی بوونی کیمیایی خوێن بوون، سەرەڕای نەخۆشییە بنەڕەتییە کوشندەکان. چارەسەری دژەتەنەکان یان پێدانی کانزاو شلەمەنی لە ڕێگەی دەمارەوە هەرچەندە کاریگەریی لەسەر نەخۆشییەکە دەبێت بەڵام ناتوانێ تەشەنەکردنی نەخۆشییە بنەڕەتییەکە بنبڕبکاو بیوەستێنێ. زۆرجار هەموو ئەوانەی گرنگیی بە چارەسەری نەخۆشەکە دەدەن پێیانوایە لە بەرژەوەندی نەخۆشەکەدایە ئێستا بمرێ، باشترە لەوەی لە ڕێگەی چارەسەرەوە دوو هەفتەیەک تەمەنی درێژتر بکرێتەوە، بڕیاردان لەسەر چارەسەر نەکردنی نەخۆشەکە لە هەر کات زیاتر ئەوکاتەیە کە دۆخی نەخۆشەکە زۆر مەترسیدارە، کاتێک زۆر بە زەحمەت دەتوانێ هەناسە بدات هەر هەناسەدانێکی جۆرێکە لە مردن، ئەم دۆخە هەستێکی زۆر بە ئازارە، ناتوانرێت هێزی ئازارەکە کەمبکرێتەوە. بەڵام ئەگەر پێمان وابوو بەرژەوەندی نەخۆشەکە لەوەدایە لە

ژیان بەردەوام بێت لەجیاتی ئەوەی لە چەند ڕۆژێکی کەمدا بمرێت، ئەوا پێویستە چارەسەری درێژکردنەوەی تەمەنی بدرێتێ. بەڵام ئێمە باوەڕمان بەمە نییە، بەڵکو باوەڕمان وایە بەرژەوەندیی باڵای نەخۆشەکە لەوەدایە ئێستا بمرێت باشترە لەوەی چارەسەری درێژکردنەوەی تەمەن وەربگرێت، چونکە کوالیتی ژیان لە سایەی نەخۆشییەکی کوشندەدا، زۆر هەژار و خراپە.

## ڕێزگرتن لە داخوازییەکانی نەخۆش

لەو وڵاتانەی ئازادی تاکەکانی تیا فەراهەم کراوە، گەورەکان دەتوانن چارەسەرە پزیشکییەکان ڕەت بکەنەوە، تەنانەت ئەگەر بشزانن ئەو چارەسەرە لە بەرژەوەندیی نەخۆشەکەشدایە. تەنانەت ژیانیشی ڕزگار بکات. بۆ نموونە بە پێی وتەکانی جیهۆڤا، دەکرێ نەخۆشێک ئەو خوێنەی تێیدەکرێت، کە ژیانی ڕزگار دەکات ڕەتبکاتەوە، ئەگەر پزیشکەکان بەبێ ویستی نەخۆش چارەسەرێک بسەپێنن، ئەوا پێشێلی ئەمانەتی جەستەی نەخۆشەکەیان کردووە. لە تێرمە یاساییەکانیشدا ئەم تاوانە دەچێتە یاسای "پاتری" ییەوە[٣].

---

٣ تاوانی یاسای پاتری (Commiting a battery) بەرکەوتنێکی نایاساییە لە گەڵ کەسێکی تر، بەبێ ڕەزامەندیی خۆی یان بە ڕەزامەندیی خۆی، لایەنی پەیوەندیدار لە تاوانکاریی پاتریدا توندوتیژ نییە، بەڵکو ڕەنگە تەنها بەرکەوتەیەکی ناشیرین و خراپی بەرامبەر کەسی دووەم ئەنجامدابێت وەکو سووکایەتی کردن، شۆرەت و ناوزڕاندن، سنووربەزاندنی سێکسی کۆم، دەم، زایەند، یاسای تاوانکاریی پاتری شێوازی تریشی هەیە وەکو تاوانی دەستدرێژی کردن، وادەخوازێ

## کوشتنی بێ ئازاری لەسەرخۆ بەشێوەیەکی بەرفرەوان پەسەندە

توورهەڵدانی دەرمان و چارەسەر تا ڕادەیەکی زۆر پەسەندکراوەو لە هەندێ هەلومەرجدا مافێکی ئەخلاقیی نەخۆشە .

١ -خزمەتی باشترین بەرژەوەندیی باڵای نەخۆش دەکات

٢ -لە گەڵ داخوازییەکانی نەخۆشدا دەگونجێت.

هەر یەکە لەم دوو مەرجە هۆکاری تەواون بۆ پشتگیری کردنی کوشتنی بێ ئازاری سست.

لە پراکتیزە کردنی پیشەی پزیشکیدا، لە سایەی هەندێک هەلومەرجی تایبەتدا لە بەرژەوەندیی کەسەکەدایە بمرێ زۆر باشترە لەوەی بژێت.لەو باوەڕەشدام کەسی نەخۆش مافی ئەوەی هەیە چارەسەری ڕزگار کردنی ژیان ڕەت بکاتەوە. وەستاندن یان فڕێدانی چارەسەر لەلایەن نەخۆشەوە لە هەردوو بارەکەدا ، هەر چەند دەبێتە هۆی مردنی نەخۆشەکە، نەخۆش بۆی هەیە بە هەر بیانوویەک بێت ڕەتی بکاتەوە .

---

بەرکەوتنێکی کردەیی ڕاستەقینەی لەشێوەی توندوتیژی جەستەیی بەرامبەر کەسی دووەم ئەنجام دابێت، تەنانەت ئەگەر توندوتیژییەکەی هەڕەشەکردن و دانەپاڵی تۆمەت بەخشینەوە بێت، بۆنموونە شێوازی هەڕەشەکردن بۆ ئەنجامدانی کردەوەی توندوتیژی (لە داهاتوودا). ئەمە تەنها بە مەبەستی ڕوونکردنەوە ئەم دوو نموونەیەم هێنایەوە، ئەگینا شێوازی یاسای پاتری هەمەجۆرەو بەپێی سنووری جوگرافی گۆڕانکاریی بەسەردادێت، لە سووکەوە بۆ قورستر( وەرگێڕ)

(یاسای ولاتانی وەکو بەریتانیا ، ئەمەریکا، کەنەدا و زۆربەی ولاتانی تر پشتگیری ئەم دۆخە دەکەن). ئەوسا دەبێ بزانین بۆچی دکتۆر کۆکس کە پزیشکێکی بەریتانییە گرنگی بە کوشتنی نەخۆشەکان دەدات؟

**دکتۆر کۆکس چی کردووە**

لیلیان بۆییس، ژنێکی نەخۆشی تەمەن ٧٠ساڵی بوو. گیرۆدەی دەستی نەخۆشی هەوکردنی توندی جومگەی ڕۆماتیزمی بوو بوو. ئازارەکەی هێند بە هێز و کووشندە بوو وا پێشبینی دەکرا دوای چەند ڕۆژێکی تر دەمرێ، چارەسەرەکان کە بەکاری دەهێنا وەکو ئەوە بوو هیچ ئازارشکێنێکی بەکار نەهێنابێ. بۆیە داوای لە دکتۆر کۆکس کرد، دەرزییەکی لێ بدات بیکوژێ. دواجار دکتۆر کۆکس داخوازییەکەی بە جێ هێناو دەرزییەکی کوشندەی لەکلۆریدی پۆتاسیۆم لێدا، لە بەر دوو هۆکار.

١ -تەسلیمی سۆزو بەزەیی نەخۆشەکە بوو.

٢ -لە سەر ویست و داخوازی نەخۆشەکە بەو کارە هەستا.

بەڵام دکتۆر کۆکس سەرکۆنەو تاوانبار کرا بە هەوڵدان بە کوشتن.

(دواجار ئەوەی کۆکسی لە ژێر قورسایی تاوانەکە دەرهێنا ئەوەبوو، نەخۆشەکە بە دەرزییەکە نەمردووە بەڵکو بە نەخۆشییەکە مردووە.)

**حوکمەکە لە دادگا لە بەم شێوەیە خوێنرایەوە، دەڵێ:**

تەنانەت ئەگەر لە کەیسی لێکۆڵینەوەی یاساییدا ئەوەی ناوی " دکتۆر کۆکسە" ... لەژێر کاریگەریی قووڵی دۆخی ستریس و بەپەلەی لیلیان بۆیی دا; کە باوەڕی وابووە بە دەنگ هاوار و ئازارەکانی لیلیانەوە چووەو لە ژێر کاریگەریی بەزەیی هاتنەوە بەهۆی ئازارە کوشندەکەیەوە بەو کارە هەستابێت، یان ئەگەر مەبەستی بنەڕەتیی کوشتنی لیلیان بێ و بۆ ئەو مەبەستە دۆزێکی کلۆریدی پۆتاسیۆمی لێدابێ، ئەوا لە هەردوو بارەکەدا تاوانبارە بە "هەوڵدان بۆ کوشتن" ... نە ویستی نەخۆشەکە بۆ مردن، نە ڕازیبوونی کەسوکاری نەخۆشەکە، ڕێخۆشکەرنین بۆ ئەنجامدانی ئەو تاوانە.

زۆر بە ڕوونی ئەم کەیسە ئەوەی بۆمان سەلماندووە، کوشتنی بێ ئازاری ئەکتیڤی "خۆبەخش" نایاساییە. بەپێی یاسای گشتیی ئینگلیزی ( کوشتنی ڕاستەقینەیە). ئەوەی شایانی باسە ئەگەر نەخۆش خۆی تەرخان کردبێ بۆ کوشتن و کەسوکارەکەی لارییان لەو کوشتنە نەبێ و پزیشکەکەی بەرژەوەندیی بالای نەخۆشەکەی لەو کوشتنەدا ببینێ، دادگا بۆچی دژی ئەم ڕاستییانە دەوەستێتەوە؟

کلیلی جیاوازی لە کەیسی نێوان کەیسی دکتۆر کۆکس و کەیسە ئاسایی و نموونەییەکانی وەستاندن و بڕینی چارەسەری یاسایی وەکو بەشێک لە پراکتیکی پزیشکیک ئەوەیە کە کوشتنەکەی کۆکس بۆ لیلیان گوایە کوشتنێکی *بێ ئازار و ئاسان نەبووە.* بەڵکو کوشتنێکی بە ئازار بووە.

## کوشتنی بە ڕەحمانە Mercy killing

ئەزمونی فەیلەسووفە مۆراڵییەکان "ئەزمونێکی فیکرییە" "ئەمەش ئەو تەسەورو دۆخە نا واقیعیانەیەیە چاودێریی سیما ئەخلاقییەکانی پەیوەست بە هەڵوێستێکەوە دەکات.

ئەم ئەزمونە فیکرییە بەکاردێنن بۆ هەڵسەنگاندنی باوەڕە ئەخلاقییەکانمان. جا لە بەرئەوە ڕەچاوی ئەوە بکە بەم ئەزمونە فیکرییەوەیە دۆخێک وەکو ئەوەی دکتۆر کۆکس هەڵدەسەنگێنن لە بابەتی کوشتنی بە بەزەییدا.

## کوشتنی بەبەزەیی: لە کەیسی شۆفێری گەمارۆدراوی نێو لۆرییەکەدا

شۆفێرێک لە نێو گڕوبڵێسەی ئاگری بارهەڵگرێکدا گیری خواردبوو. هیچ ڕێگەیەکی بۆ دەربازبوون نەمابوو، خەریکبوو بە گڕی ئاگرەکە دەسووتا تامردن. هاوڕێیەکی شۆفێرەکە لای بارهەڵگرەکە ئامادەبوو. ئەم هاوڕێیە تفەنگێکی پێبوو و نیشان شکێنێکی باشبوو، شۆفێرەکە داوای لە هاوڕێکەی کرد بە گوللەیەک بیکوژێ، چونکە بەرگەی ئازاری ئەو سووتانەی نەدەگرت، گولەکە ئازاری کەمترە لەوەی بەچاوی خۆی مەرگی خۆی بە ئاگرەکە ببینێ.

من دەمەوێ هەموو بەها یاساییەکان بخەمە لاوەو پرسیارێکی ئەخلاقی ڕوون بکەم: ئایا ڕەوایە ئەو هاوڕێیە تەقە لە شۆفێرەکە بکات؟

لێرەدا دوو هۆکار هەیە هاوڕێکە ناچار دەکات، شۆفێرەکە بکوژێت:

١-بەو کارەی شۆفێرەکە کەمتر تووشی ئازار دەبێت.

٢-شـــۆفێرەكە خـــۆی داوای كـــردووە بە گـــوللەیەك بیكوژێت.

ئەمە ئەو دوو هۆكارەیە ئێمە بیرمـان لێكردەوە لە پاسـاو هێنانەوە بۆ كوشتنی بەزەیی پاسیڤ و سست. ئەو هۆكارانە چـین وا لە تـۆ دەكـات بـاوەڕت بەوە هەبـێ پێویسـت نەكـات هاوڕێ شۆفێرەكەت بكوژێت؟

بیر لە حەوت خاڵ دەكەمەوە:

١-ڕەنگە هاوڕێكە بەو گوللانە شۆفێرەكە نەكوژێت بەڵكو برینـداری بكـات، ئەو كـاتە ئـازارەكە دوو بەرامـبەر دەبێـت، زیاتر لەوەی تەنها بە ئازاری ئاگرەكە بمرێت.

٢-ئەگەری هەیە شـۆفێرەكە چانسـی ئەوەی هەبێـت تـا مردن نەسووتێت، بەڵكو لە ئاگرەكەو مردنیش ڕزگاری بێت.

٣-شـتێكی ناشـرینە بـۆ هـاوڕێكە لە مـاوەیەكی كەمـدا: هەست بە تاوان دەكات بەرامبەر شۆفێرەكە.

٤-هەرچەنـدە ئەم كەیسـە ڕەنـگە ڕاسـتییەكی تیابێـت لە كوشتنی شۆفێرەكەدا، بەڵام هێشتا ئەم كردارە بە هەڵە دێتە ئەژمـار، چـونكە بەلای كەمەوە ئەگەر پابەنـد نەبـین بەوەی كوشتن تـاوان و هەڵەیە، ئەوا ڕەنگە جاری تریش تێكەوین، لە دەمێكی نزیكدا هەڵەی لەو شـێوەیە بكەیـن و پێمـان وابێ، لە بەرژەوەنـدیی قوربـانییەكەدا ئەو تاوانەمـان ئەنجامـداوە. ڕەنگە زیاتر بەردەوام بین و خەڵك بكوژین، ئەمجارەیان لە بەرژەوەندی خۆماندا.

٥-لە گفتوگۆ لەگەڵ سروشتدا ڕێگە بـۆ سروشـت خـۆش دەكەین: كاتێ چارەسەرەكە ڕادەگرین یـان فڕێـی دەدەیـن، لە دۆخـی نەخۆشـێك كە لە گیـانەڵادایە، ڕێگە خۆشـدەكەین بـۆ

سروشت ڕەوتی خۆی وەربگرێت، ئەو کاتە سروشت دەست وەردەداتە کوشتنەکە، ئەمەش هەڵەیە.

٦- گفتوگۆ سەبارەت بە ڕۆڵی خودا، چونکە ئەم کارە کاری خودایە، مردن مۆدێلێکی ئاینییە نەک سروشتی. کوشتن، خودا ڕۆڵی تێدا دەگێڕێت، هەستان بە ڕۆڵی مردن تەنها بۆ خودایە. لەلایەکی ترەوە ئەم کارە ڕۆڵی خودا زەوت ناکات، بەڵکو یارمەتیدەرە ئەگەر بە گرنگی و خۆشەویستییەوە، هەوڵی بە دەستهێنانی ویستی خوا دەدەیت.

٧-کوشتن لە ڕووی پرەنسیپەوە هەڵەیەکی مەزنە، جیاوازی نێوان کوشتنی بەبەزەیی سست و کوشتنی ئاسان ئەوەیە یەکەم ڕێگە بە مردن دەدات ئەویتریان کوشتنە، کوشتن هەڵەیە، هەڵەیەکی بنەڕەتییە.

مەودای ئەم مشتومڕانە چەندە؟ یەک لەدوای یەک دەیانخەینە بەر باس.

## مشتومڕی یەکەم

لە ڕاستیدا ئێمە دڵنیا نیین لە دەرەنجامەکەی. ئەگەر پشت بە مشتومڕی یەکەم دەبەستیت، ئەوا سوور نابیت لەسەر ئەوەی کوشتنی بەبەزەییانە لە ڕووی پرەنسیپەوە هەڵەیە، بەڵام کێشەکە ئەوەیە، تۆ ناتوانیت دڵنیا بیت لەوەی مردنەکە بە بێ ئازار کۆتایی دێت. من خۆشحاڵم بەوەی کە بە تەواوی دڵنیانیم لەوەی کوشتن بە گوللە بێ ئازارە. بۆ ئەم بابەتە ئەگەری سێ دەرەنجام هەیە:

(أ) ئەگەر هـاوڕێکە تەقەی نەکـرد (یـان تەقەی کـرد و گوللەکە سـەری کرد و بە هەڵە ڕۆیشـت) ئەوا شـۆفێرەکە بە ئازارێکی زۆرەوە دەمرێ- با بڕی ئەم ئازارە ناو بنێین X.

(ب) هاوڕێکە تەقە دەکاو ئامانجەکە دەپێکێ: شۆفێرەکە یەکسەر دەمرێ، بەزۆری مردنەکەی بە بێ ئازار دەبێت. لەم کەیسـەدا، بڕی ئازارەکە نـاو دەنێین Y ، لەم کـاتەدا y زۆر بچووکترە لە X – لە ڕاسـتیدا Y بە زۆری سـفرە، ئەگەر بە پێـوەری ئازارچەشـتن لە سـاتی تەقەکردنـی هـاوڕێکەدا بەراوردی بکەین.

(ت) هاوڕێکە تەقە دەکا، بەڵام شـۆفێرەکە نـاکوژێ، تەنها برینـداری دەکـات، بەشـێوەیەکی گشـتی دەبێتە هـۆی ئەوەی بـڕی ئـازارەکەی Z بێـت، Z گەورەتـرە لە X بەهـۆی ئەگەری (C) ەوە. بە گـوێرەی مشـتومڕی ۱ ، لەم دۆخەدا باشتروایە هاوڕێکە تەقە لە شۆفێرەکە نەکات.

ئـێمە ئێسـتا دەتـوانین بەراوردی دۆخەکە بکەیـن کـاتێ هـــاوڕێکە تەقە لە شـــۆفێرەکە ناکـــات، لە گەڵ ئەو دۆخەی هاوڕێکە تەقە لە شۆفێرەکە دەکات. لە کەیسی یەکەمـدا کۆی قەبـارەی ئازارەکـان X ە، بەڵام ئەوی دوایـی Y ە ، یـان (لە سفرەوە نزیکە)، یان (لە X گەورەترە) ، بەمجۆرە هـاوڕێکە بە تەقەکردن یان کێشەکە هیورتر دەکاتەوە ( ئازاری کەمتر) یـان بـاری کێشـەکە گەورەتـر دەکـاتەوە ( ئـازاری زیـاتر). ئەوەی گرنگە بۆ ئێمە نەهێشتنی ئازارە، ئیتر کامیان باشترە، تەقە بکرێت یان نا، پشت بە جیاوازییەکانی نێوان X, Y, Z دەبەســـترێ، لەگەڵ ئەگەرەکـــانی ڕوودانـــی هەر یەک لەم دەرەنجامانە. ئەگەر تا ئێستا، دەرەنجامی مەرگی خێرا، تەقە کردنەکە بە ڕاستتر بزانێ. هەروەهـا ئاسـتی ئازارکێشـانی Z

وئەگەر ئاستی ئازارکێشانی Z کەمتر بێت لە X ئەوا تەقەکردن لە شۆفێرەکە ڕەوایە چونکە چانسی تەقەکردنەکە بەشێوەیەکی بەرچاو لە بەرژەوەندی کەمکردنەوەی ئازارکێشاندایە.ئێمە زۆر بە دەگمەن دەتوانین دڵنیابین لە دەرەنجامەکان. ئەگەر ئەم نادڵنیابوونەش هۆکارێک بێت بۆ ئەنجام نەدانی کارەکە ئەوا بە تەواوی ئیفلیج دەبین لە بڕیاردان لە سەر ژیان. سەرباری ئەوەش کوشتنی بێ ئازار هاوشێوەی کەیسەکەی (دکتۆر کۆکس) لە ژینگەی پزیشکیدا بە ڕاست نازانرێ. ئێستا بۆم دەرکەوت مشتومڕی یەکەم ئەنجامێکی قایلکەری سەبارەت بە کوشتنی خۆبەخشی چالاک بەدەست نەهێنا.

**مشتومڕی دووەم**

مشتومڕی دووەم دیوەکەی تری مشتومڕی یەکەمە، گیرۆدەی هەمان کێشەو لاوازییە. مەسەلەی ئەگەر بێت و چانسی شۆفێرەکە بۆ دەربازبوون لەسەرووی چانسی ئازار کێشان و مردنی بێت، لە ڕاستیدا پشت بە کۆمەڵێک ئەگەر دەبەستێ. ئەگەر چانسی شۆفێرەکە دوور بوو لەوەی بژێت، ئەوا مشتومڕی دووەم قایلکەر نییە.

پشتگیرانی مشتومڕی دووەم، دژی ئەم بیرۆکەیە دەوەستنەوەو دەڵێن ئەو قورساییەی خستوویانەتە سەر ئەگەری دەربازبوون، لە سووتانی بارهەڵگرەکە بێسنوور ئەگەرێکی دوورە.

لەو کەیسەدا هەرچەندە ئەگەری ڕوودانی لاوازە، پێویستە دەرفەتەکە بقۆزینەوە. بۆ ئەم دیبەیتە سێ کاردانەوە هەیە:

یەکەم، لەسەر چی بنەمایەک ئەو قورساییە بێسنوورە دەبەخشرێتە ئەگەری دەربازبوون؟ دووەم، ئەگەر وامان دانا ئەگەری دەربازبوون ئەگەرێکی دوورە، بیانوو بۆ تەقەنەکردن چییە, ئەگەر گەیشتینە هەمان دەرەنجام کە پێویستە تەقە بکرێت. چونکە ئەگەر تەقە بکرێت شۆفێرەکە دەکوژرێت هیچ نەبێ گوللەکە دەرگای کابینەکە دەشکێنێ و شۆفێرەکە ڕزگاری دەبێت. سێیەم، ئەگەر مشتومڕی دووەم هۆکارێکی قایلکەری هەبوو بۆ ڕەتکردنەوەی کوشتنی بێ ئازارچەشتن، ئەوا هۆکارێکی قایلکەریشی پێیە بۆ ڕەتکردنەوەی وەستاندنی چارەسەری پزیشکی لە هەموو دۆخەکاندا. ڕەنگە پێدانی چارەسەر بە تەواوی تەمەن درێژ بکاتەوە بەڵکو لە ڕێگەی "موعجیزە" یەکەوە نەخۆشەکە چارەسەر بێ و بۆ ماوەیەکی زۆر بە تەندروستییەکی باشەوە بژێت.

### مشتومڕی سێیەم

مشتومڕی سێیەم شکستی هێناوە، چونکە ئەویش هەمان ئەو پرسیارە دەورووژێنێ، کە مشتومڕی زۆر هەڵدەگرێ. پێویستە هاوڕێکە تەنها ئەو کاتە هەست بە تاوان بکات کاتێ بە هەڵە تەقە لە شۆفێرەکە دەکات، بەڵام لێرەدا مەسەلەکە ئەوەیە، هەڵە کامەیە ڕاست کامەیە. ئەگەر مەسەلەکە ڕەوا بێت، کەواتە هاوڕێکە پێویست ناکات لە تەقەکردن لە شۆفێرەکە نیگەران بێت و هەست بە تاوان بکات (بەو کارە ئازاری شۆفێرەکە کەم دەکاتەوە)، ئەگەری هەستکردن بە تاوان، ڕێگە چارە نییە بۆ بڕیاردان لەوەی هاوڕێکە چی بکات. سەرەتا پێویستە وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە،

وەڵامە ڕاستەکە کامەیە، تا ئەنجام بدرێت، ئینجا دوایی تەنها ئەو پرسیارە بکەین ئایا پێویستە هاوڕێکە هەست بە تاوان بکات یان نا.

## مشتومڕی چوارەم

مۆدێلێکە بە " گفتوگۆی خزان لە لێژایی " ەوە ناسراوە. لە ڕەوشتە پزیشکییەکاندا ئەمجۆرە گفتوگۆیە، گفتوگۆیەکی گرنگە ( لە بەشی پێنجەمدا وردتر لێی دەدوێم). من ئەم لێژاییە یان سەرەو ژوورەیە بۆ دوو بەش لێک جیادەکەمەوە- خزانی لۆجیکی یان چەمکە فکرییە خزاوەکان (تیۆری)؛ لەگەڵ خزانی ئەزمونی یان خزانی پراکتیکی. جۆرەکانی ئەقڵی پێویست لە بەرەنگاربوونەوەی دیبەیتی خزان لە لێژاییەوە وەکو دەبینین پشت بە جۆری ئەو مشتومڕە دەبەستێت کە پێشکەش دەکرێت.

## مشتومڕی پێنجەم و شەشەم

دیبەیتەکان لە سروشتەوەیەو خودا ڕۆڵی تێدا دەبینێ، هاوشێوەی دیبەیتی خزان لە لێژاییە، زۆر پراکتیکی و گشتین لە ڕەوشتە پزیشکییەکاندا. ( لە بەشی پێنجەمدا بەوردی باسی دەکەم ).

## مشتومڕی حەوتەم

لەنێو هەموو گفتوگۆکاندا کە سەرنجم داوە، تاکە گفتوگۆیە هەموو گفتوگۆکان دەوەستێنێ و ڕاشکاوانە دەڵێ، کوشتنی بێ ئازار لە ڕووی پرەنسیپەوە هەڵەیە.

**ئایا کوشتنی بە بەزەییانە لە ڕووی پرەنسیپەوە هەڵەیە؟**

لەم قۆناغەدا پێویستمان بە ڕوونکردنەوەی ماناکانی ' کوشتن' ە. ئەو کەسانەی باوەڕیان بە کوشتنی بێ ئازار هەیە، بەڵام نەک وەکو ئەوەی لە کوشتنی بە بەزەییانەی پاسیڤدا لە کاری پیشەی پزیشکیدا باوە، لە بەرئەوە کوشتنی بە ڕەحمانە لە ڕووی پرەنسیپەوە هەڵەیە، لە بنچینەدا ئەو کوشتنە بەڕەحمانەیە هۆکاری مردنی کاریگەرە، لە تاوانی کوشتندا.

بەڵام ئەم بۆچوونە بە سەرنجدان لەم دۆخە پزیشکییەی خوارەوە، ناتەواوە. هەندێجار ئەو نەخۆشانەی لە مردنەوە نزیکن و چارەسەریان نییە، مۆرفینیان لێدەدەن لە پێناوی دڵنیابوون لەوەی نەخۆشەکە تا بتوانرێ کەمترین ئازار بچێژێ. جگە لەوەش مۆرفین هەناسە بڕکێ و پشێوی هەناسەو تەنگە نەفەسی کەم دەکاتەوە ( لە ڕێگەی کارکردنییەوە لەسەر ئەو بەشەی مێشک کە کۆنترۆڵی هەناسەدان دەکات).

لە هەندێ دۆخدا، نەک هەموو دۆخێک ڕەنگە مۆرفین پێشبینی ئەوەی لێ بکرێ کاریگەری لەسەر کورتکردنەوەی تەمەنی نەخۆشەکە هەبێت، سەرەڕای کەمکردنەوەی ئازار. دکتۆرێک کە مۆرفین دەداتە نەخۆشێک بە مەبەستی کۆتایی هێنان بە ئازاری نەخۆشەکە (هەرچەندە بە بێ مەبەست)ە، پێشبینیی مردنی نەخۆشەکەش دەکات، دکتۆرەکە بەو کارەی یاسا شکێنی نەکردووە. لە ڕاستیدا پێدانی مۆرفین لەم هەلومەرجانەدا زۆرجار خزمەتێکی پراکتیکی کلینیکیی ڕەوایە. پێدانی دەرزیی مۆرفین تەنها شتێکی ئەکتیڤە ئەنجام دەدرێ هاوشێوەی دەرزی کلۆریدی پۆتاسیۆم. جیاوازییە

سەرەکییەکە لەوەدایە کەیسی کلۆریدی پۆتاسیۆمەکە بە مەبەستی مردنی نەخۆشەکەیە- تەنها بە مەبەستی کەمکردنەوەی ئازاری پێش مەرگە. بەڵام لە کەیسی مۆرفینەکەدا مەبەست کەمکردنەوەی ئازاری نەخۆشییە، ڕاستە پێشبینی مردن دەکرێت بەڵام بە مەبەست نییە.



وێنەی (٤) دکتۆری A دەرزی مۆرفین( ئازارشکێنێکی بەهێزە) بەکار دێنێ بە مەبەستی کەمکردنەوەی ئازاری نەخۆشێک لە گیانەڵادایە، پێشبینی کراوە نەخۆشەکە بەخێراییەکی زیاتر دەمرێت. دکتۆری B دەرزی مۆرفین بەکاردێنێ بە مەبەستی ئەوەی بە خێرایی نەخۆشەکە بمرێت، بە مەبەستی کەمکردنەوەی ئەو ئازارەی دووچاری نەخۆشەکە بووە. ئایا جیاوازییەکی مۆراڵی هەیە لەوەی دکتۆری A ئەنجامی داوە لەگەڵ ئەوەی دکتۆری B ئەنجامی داوە؟

بەهەر حاڵ لە بەریتانیاو وڵاتانی تر یاسا چۆن لەم بابەتە دەڕوانێت.

لەم شیکارییانەدا، کوشتن وەکو لە کوشتنی بەڕەحمانەدا هاتووە، دوو لایەنی هەیە: ئەوەی دەکرێت کارێکی ئەرێنییە

(تەنها سڕینەوەی کارەکە نییە)؛ لەگەڵ مردنی بە مەبەست ( تەنها پێشبینی کردن نییە). هەردوو لایەنەکە بۆ پێناسە کردنی کوشتن پێویستن، بەڵام هەریەکێکیان بە تەنیا ناتەواون. بە کورتی، ئەو وتەیەی پێیوایە کوشتنی بە ڕەحمانە لە ڕووی پرەنسیپەوە هەڵەیە، گرنگییەکی ئەخلاقی گەورەی هەیە لەسەر: (١) جیاکردنەوەی کردەوە لە چاوپۆشیکردن (٢) جیاکردنەوەی مەبەست لە پێشبینی کردنی مردن. هەر یەکە لەم دوو مەسەلەیە جا ئیتر چ مۆراڵی بێت یان چەمکێکی فیکری بێت، جیاوازی دەکات لەنێوان کردەوەو غافڵگیری لە لایەک و مەبەست و پێشبینی کردن لە لایەکی ترەوە.

**دۆخە گریمانەییەکان (ئەزمونە فیکرییەکان) بۆ پشکنینی مۆراڵ بایەخدارە لە جیاکردنەوەی هەر دەرەنجامێک لە نێوان کرداروو چاوپۆشیکردن؛ هەروەها جیاکردنەوەی ئامانج لەگەڵ پێشبینی کردن**

**١-لە کەیسی سمیس و جۆنزدا**

**سمیس خۆی دزیەوە بۆ گەرماوی ماڵی ئامۆزا شەش ساڵییەکەی و ئەوی لە حەوزەکەدا نقووم کرد، شتەکانی بە شێوەیەک ڕێکخست وەکو ئەوەی ڕووداوێک بێت. ئەو هۆکارەی وای لە سمیس کرد ئامۆزاکەی بکوژێت، ئەوەبوو تا میراتی زیاتری بەرکەوێت.**

**جۆنز میراتێکی گەورەی هاوشێوەی بەردەکەوێت لە مردنی ئامۆزا شەش ساڵییەکەی کە سمیسە. جۆنز هەروەکو سمیس خۆی دەدزێتەوە بۆ گەرماوی ئامۆزاکەی بە مەبەستی ئەوەی لە ئاوەکەدا نقوومی بکات، هەرچەندە بە ڕێکەوت سمیس پێی دەخلیسکێ و سەری بەر لێواری گەرماوەکە دەکەوێ و نقووم دەبێ، بەڵام جۆنز**

دەتـوانێ زۆر بە ئاسـانی ئـامۆزاکەی ڕزگـار بکـات، بەڵام دوور دەگرێ و چاوەڕوانی دۆخەکە دەکات تاکو ئەگەر سمیس سەری دەرکرد پاڵی پێوە بنێتەوە بۆ ژێر ئاوەکە، ئیتر ئەوەبوو پێویستی بەوە نەبوو سمیس خۆی خنکا.

ئایا هیچ جیاوازییەکی ئەخلاقی لە نێوان ڕەفتاری سمیس و جۆنزدا هەیە؟

لە ڕووی ڕەوشـتەوە هەردوو کەیسـەکە پشـتگیری ئەو ڕایە دەکەن، هیچ جیاوازییەک لە نێوان کردەی کوشتنی بە ئەنقەست و خۆگێل کردنەکە (هەوڵنەدان بۆ ڕزگارکردن) ەکە نییە. ویست و ئەنجام یەک شتن.

٢- هەردوو کەیسی ڕۆبنسن و داڤیس

ڕۆبنسـۆن ١٠٠ جـونەیهی ئیسـتەرلینی نابەخشـێتە ئەو دەزگـا خێرخـوازییەی یـارمەتی بەرەنگـاربوونەوەی برسـێتی دەدات بـۆ وڵاتێکـی هەژار، لە ئەنجامـدا یەکێـک لە برسـا دەمرێـت، ئەگەر ڕۆبنسۆن ئەو پارەیەی بناردایە، ئەو کەسە لە ژیاندا دەبوو.

داڤیس ١٠٠ جونەیهەکە دەنێرێت بەڵام لەگەڵیدا پریاسکەیەکی خـۆراکی ژاراوی دەنێرێـت بـۆ کـۆمەڵەکە لە ئەنجامـدا هەر بە مەبەست یەکێک بە خۆراکە ژاراوییەکە گیانی لە دەستدا و بە ١٠٠ جونەیهەکەش ژیانی یەکێکی ڕزگار کرد.

ئایـا هـیچ جیـاوازییەکی ئەخلاقـی هەیە لە نێـوان ڕەفتـاری ڕۆبنسـۆن و داڤیسـدا؟ ئەگەر هەیە ئایا لەبەرئەوەی داڤیس کـاری لەسـەر کوشـتن کـردووە، بەڵام ڕۆبنسـۆن تەنهـا ڕەفتـاری خۆگێلکردن بووە؟

ئەم جـووتە کەیسـە جیـاوازە لە هەردوو کەیسـەکەی سـمیس و جۆنز، هەرچەنـدە بە تێکڕایی و لە ڕووی دەرنجامەوە هاوشـێوەن، بەڵام لە کردەوەی (ناردنی توێشـەبەرەیەک خـواردنی ژەهـراوی) بە مەبەست بۆ کوشتن، لە ڕووی ئەخلاقییەوە زۆر خراپترە لە کەیسی

خۆگێلکردن ( نە ناردنی یارمەتی خێرخوازیی خێرا).

**٣- قوربانیدان بە کەسێک بۆ ڕزگارکردنی پێنج کەس**

*شەمەندەفەری لاسار:* شەمەندەفەرێک لە خاڵی تێکەڵبوونی لاینەکان نزیک دەبێتەوە، لەبەرئەوەی خاڵەکان گۆڕانکارییان تێدا نەکرابوو، شەمەندەفەرەکە پێنج کەس دەکوژێت لەوانەی لەسەر خەتەکە کۆمەڵەیان بەستبوو، ئەگەر خاڵەکانی تر گۆڕانکارییان تێدا بکرایە، ئەوا شەمەندەفەرەکە بە درێژایی هێڵێکی جیاوازدا دەڕۆیشت و تەنها یەک کەسی (جیاواز)ی دەکوشت، هیچ ڕێگەیەک بۆ وەستانی شەمەندەفەرەکە نییە، بەڵام دەتوانیت خاڵەکان بگۆڕیت، تاکو یەک کەس بمرێت، باشترە لەوەی پێنج کەس بمرێت.

**ئایا پێویستە خاڵەکان بگۆڕیت؟**

*بەخشینی ئۆرگانی جەستە*: کەسێکی لەشساغ دەکوژرێت، بۆ ئەوەی ئەندامەکانی لەشی، ژیانی پێنج کەسی تری پێ ڕزگار بکرێت، کە ئەندامە جیاوازەکانی جەستەیان لە کار کەوتووە.

ئایا کەسێکی لەشساغ دەکوژرێت بۆئەوەی ئەندامەکانی لەشی بەکار بهێنرێت؟

کەسانی ژێر پێیانوایە، سەرەتا ڕاستتروایە جێگۆڕکێ لە خاڵەکاندا بکرێت ( تاکو کەمترین کەس ببێتە قوربانی)، کەواتە **ڕەوایە** کەمترین کەس ببێتە قوربانی، بەڵام **ڕەوا نییە و هەڵەیە**، کەسێک بکوژێت بۆئەوەی ئەندامەکانی جەستەی بۆ ڕزگارکردنی گیانی چەندەها کەسیتر بەکار بێنیت. لەگەڵ ئەوەشدا لە هەردوو دۆخەکەدا، لە ڕێگەی نەکردنی ئەوەی پێویستە بکرێت پێنج کەس دەمرێت، لە ڕێگەی کردارەوە دەکرا تەنها یەک کەس بمرێت. پاساوی حەکیمانەی باو بۆ ئەم نموونانە چییە؟ ئەم جووتە نموونەیە پشتگیری لەو بۆچوونە دەکات کە دەڵێ، سروشتی کردەوەکان دەتوانیت جیاوازییەکی ئەخلاقیی مەزن بخوڵقێنن، تەنانەت ئەگەر یەک ئەنجامیشیان هەبێت.

ئەم بابەتە مشتومڕی زۆری لە بارەوە کراوەو بەشێوەیەکی گشتی ڕێک نەکەوتوون لەسەر هەڵوێستێکی یەکگرتوو. هەندێ لەو ئەزمونە فکرییانەی کە هەردوو لایەن لە گفتوگۆکەدا بە کاریان هێناوە دەمانباتەوە چوارگۆشەی یەکەم. لەبەرئەوە نامەوێ زۆر درێژە بەم باسە گشتییە بدەم تەنها ئەوەی پەیوەندی بە دیبەیتی کوشتنی بێ ئازارەوە هەیە، لێی دەدوێم.

ئەوەی شایانی باسە هەموو ئەم ئەزمونە فکرییانە لە بازنەی کوشتندا دەسووڕێنەوە، یان غافڵگیری و خۆ گێل کردن لە ڕزگار کردنی کوژراوەکەدا، ئەمە لە بەرژەوەندیی کەسێکدا نییە. سەرەڕای ئەوەش هەندێ لە نموونەکان، کەسێک دووچاری کوشتن دەکاتەوە لە پێناو ڕزگارکردنی کەسێکی دی. بێگومان لە چوارچێوەی کوشتنی بەرەحمانەدا ئەمەش لە بار نییە. من دەزانم لە ئەزمونی فکریدا یان لە ڕووی تیۆرییەوە شتێکی قایلکەر نییە جیاوازییەکی ئەخلاقی بخاتە بەرچاو لەنێوانی کردەوەو غافڵگیری، یان لە نێوان مەبەست و پێشبینی، کە هەر سێ تایبەتمەندییە سەرەکییەکەی کوشتنی بێئازار وەکو ئەمانەی لای خوارەوە بگرێتە خۆ:

١- ئەو کەسەی کە کردەوەکەی ئەنجامداوە، بەشێوەیەک هەڵیسەنگێنین کە ئەرکێکی گرنگی ئەنجامداوە بەرامبەر ئەو کەسەی مردووە.

٢- ئازاردانی کەسێک لە بەرژەوەندی ئەوی تردا، بە کێشە دانانرێت.

٣- کاتێ مردن لە بەرژەوەندیی بالای ئەو کەسەیە کە دەمرێت.




شێوەی (٥) ئەگەر هێنری بەربەستەکە نەگۆڕێت، ئەوا شەمەندەفەرەکە بەو ئاراستەیەدا دەڕوات کە خۆی دەیەوێت واتە ئاراستەی A ، بەڵام ئەگەر بەربەستەکەی لە ڕێگەی ئاراستەی A دابنایە ئەوا شەمەندەفەرەکە لە ڕووی ناچارییەوە بە ئاراستەی B دا دەڕۆیشت نەدەبووە هۆی کوشتنی ٥ کەس، بەڵکو یەک کەسی دەکوشت.

## کوشتنی هەڵە ئازار بە مردووەکە دەگەیەنێت

مەسەلەی بەرهەڵستکارانی مەرگی بە بەزەیی پشت بە یەک پرەنسیپی بنەڕەتی دەبەستن: کوشتن لە ڕووی ئەخلاقییەوە هەڵەیە. ڕەنگە ئەوان لە دۆخە دژوارەکاندا ڕێگە بەوە بدەن کاتێک کەسێک دەکوژرێ، ژیانی کەسێکی تر یان چەند کەسێکی تر ڕزگار بکات. لەم هەلومەرجانەدا ئەمجۆرە کوشتنە بە ڕەوا دەزانن، بەڵام لە کوشتنی بە ڕەحمانەدا کە نەبێتە هۆی ڕزگارکردنی ژیانی کەسێکی تر، ئەوە بە پەسەند نازانن. کوشتنی بەڕەحمانە لە بنەڕەتەوە هەڵەیە ئەگەر لە بەرامبەردا نەبێتە هۆی ڕزگارکردنی گیانی کەسێکی دی. ڕەوایە ئەگەر ئەو هەستە بەهێزەمان هەبوو

کە کوشتن هەڵەیە. لای زۆر کەس مردن لە ئێستادا زیانی زۆر زیاترە بەبەراورد لەگەڵ ئەوەی کەسەکە لە ژیاندا بووە. هۆکاری ئەوەی بۆچی کوشتن هەڵەیەکی گەورەیە، لە بەرئەوەی کوشتن لە ڕاستیدا ئازارێکی گەورەیە. لە گەڵ ئەوەشدا کوشتنی بە هەڵە دەرەنجامی ئازاردانێکە لەکاتی مردندا نەک بە پێچەوانەوە.

ئەگەر لە بەرژەوەندیی نەخۆشێکدا بوو ئێستا بمرێت باشترە لەوەی ئازاری مەرگ بچێژێ، ئەوا کوشتن بە هەڵە نایەتە ئەژمار، بە واتایەکی تر کاتێ مردن سوودی هەیە نەک زیان، کەواتە کوشتن هەڵە نییە. ئەوانەی دەڵێن کوشتنی ئاسان لە ڕووی پرەنسیپەوە هەڵەیە، ئەوا لینکی چەمکی فکریی نێوان هەڵەی کوشتن و ئازاری مەرگیان لە یادکردووە.

### سەرەنجام

من ئەو بۆچوونە ڕەتدەکەمەوە کە دەڵێ کوشتنی خۆبەخشی خێراو ئەکتیڤ پرەنسیپێکە لەسەر ئەو بنەمایە دامەزراوە کە گالیسکە دەخاتە بەردەمی ئەسپ: ئازاری مردن وا دەکا کوشتن هەڵە بێت. کاتێ بە هۆی ئەنجامی شوێنکەوتنی پرەنسیپێکی ئەخلاقییەوە گیرۆدە دەبین ئەوا زۆر بەوردی پێویستمان بە پرەنسیپێکی ئەخلاقی هەیە و دەپرسین ئەوەی جێ بەجێی دەکەین شێوازێکی ڕەق و ناپەسەندە. من پێموایە ڕەنگە ئەمە بێت وای کردبێت، کە کوشتنی خۆبەخش هەڵەیەکی ئەخلاقی بێت. لە ڕاستیدا گەڕان بەدوای ڕەوشتی پاکدا ئەگەر لەسەر حیسابی ئەوانیدی بەدی بهێنرێت کارێکی چەوتە.

# بەشی ٣

# بۆچی ئەو 'ئاماریيانەی' بە گیانیان قوربانی دەدەن بە سووك سەیر دەكرێن

ئەگەر بەختەوەری ئەو ئامانجە بێت كە سەرچاوەكەی ڕەوشت بێت - بە هەر جۆرێک بێت پێویستە ئاماژە بە ئامانجێک بدرێت و لە ژێر هەیمەنەی هەستی تاریک یان ئەو باوەڕە ناوخۆییەی كە لێكدانەوە هەڵناگرێ، دەربهێنرێ. پێویستە مەسەلەی ئەقڵ و شیكردنەوە ڕۆڵی تێدا ببینێ، چونكە ناكرێت تەنها هەست و سۆز بكرێتە بنەمای زۆرێک لە ئایدیا ڕەوشتییەكانی فەلسەفە.

(جۆن. ستوارت. میڵ، لەندەن- ١٨٣٨)

## بەهای دراو لە ژیاندا

لە کانوونی دووەمی ١٩٩٧ تۆنی بولیمۆر لە پێشبڕکێی جیهانیی یەخت و بەلەمی ڤێندی گلۆبدا لە فەرەنسا. هەوڵیدا گەشتێکی دەریایی بە دەوری جیهاندا بکات، گەیشتە ئاوە ساردو ترسناکەکانی ئۆقیانووسی خواروو، لە دووری ١٥٠٠ میل لە خوارووی کەناراوەکانی ئۆستترالیا، بە هۆی زریان و ڕەشەباوە شەپۆلە شێتەکانی دەریا بەلەمەکەیان تێکشکاند، بۆ ماوەی چوار ڕۆژ لەسەر هەیکەلی بەلەمە تێکشکاوەکە گیری خوارد، پێشئەوەی لە ڕێگەی گەورەترین ئۆپراسیۆن بە تێچوونی خەرجێکی زۆرەوە، هێزەکانی بەرگریی ئۆستترالیا توانییان ڕزگاری بکەن. دەبێت لە کۆمەڵگەیەکی مەدەنیدا چەندە پارەی تێ بچێت تا ژیانی کەسێک ڕزگار بکەیت؟ ئایا وەڵامەکە ئەوەیە " هەرچەندی تێ بچێت " یان " پێویستە پارەیەکی سنووردار بێت ؟ " لە کاتێکدا ڕەنگە لەو ئۆپراسیۆنە گەورەو گرانبەهایەدا چانسی ڕزگارکردنی ژیانی گەشتیارەکە کە لە مەترسیدایە زۆرکەم بێت؟

با پرسیارێکی زۆر گشتی بکەم. بەهای ڕزگارکردنی ژیانی مرۆڤێک بە پارە چەندە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە تاڕادەیەک پارادۆکسانەو بێزارکەرە، خۆدزینەوە لە پرسیارەکە و دابینکردنی تێچوویەکی کەم، کە ڕەنگە گیان لە دەستدانی کەسەکەی لێ بکەوێتەوە، یەکێکە لەوەڵامەکان لە یەکێک لە دۆخەکاندا.

وێنەی (٦)
له




**کۆمەڵگەیەکی شارستانیدا پێویستە چەندە پارە خەرجبکرێت بۆ ڕزگارکردنی گیانی کەسێک؟**

هیچ سیستەمێکی چاودێری تەندروستی لە جیهاندا بە تێکڕا بڕێکی پارەی زۆری لە هیچ کەیسێکدا بۆ نەخۆشەکانی دابین نەکردووە ( بڕوانە لیستەکەی خوارەوە). بەردەوام چارەسەرەکان لە پێشکەوتندان و چارەسەری نوێترو باشتر دێتە ناو سیستەمی تەندروستییەوە، بە تێکڕایی لە بەریتانیا مانگانە بە نزیکەی سێ مادەی دەرمان مۆڵەتی پێدەدرێت، بەزۆری هەر دەرمانێک سوودی زیاتری لە دەرمانەکانی پێشوو هەیە، لە چارەسەرکردندا و تەمەن درێژتر دەکەنەوە،

بەڵام نرخی هەندێک لەم دەرمانانە زۆر گرانە. چی کاتێک سوودی زیاتر شایستەی خەرجی زیاترە؟ پێویستە ئەم پرسیارە لە لایەن هەموو سیستەمەکانی چاودێری تەندروستییەوە وەڵام بدرێتەوە، چی ئەوەی کەرتی تایبەت بێت وەکو ئەوەی لە سیستەمی ئەمەریکیدا هەیە، چی ئەو سیستەمانەی لە لایەن کەرتی گشتییەوە بەڕێوە دەبرێن وەکو خزمەگوزاریی تەندروستیی نیشتمانی کە لە بەریتانیا هەیە. ئەگەر نە توانرا بەردەوام باشترین چارەسەر دابین بکرێت، ئەوا پێویستە ڕێگەی تر هەڵبژێرین. پرسیارە گشتییەکە سەبارەت بە دابەشکردنی مادەکانی چاودێری تەندروستیی سنووردار لای ئێمە، گرنگترین پرسیاری ڕەوشتە پزیشکییەکانە.

**خەرجی نیشتمانی بۆ تەندروستی: لە هەندێ لە وڵاتە دەوڵەمەندەکاندا**

| وڵات | ٪ بەرهەمی ناوخۆ | داهاتی تاک بە دۆلار |
|---|---|---|
| ئۆستراليا | ٨،٦ | ٢٠٨٥ |
| کەنەدا | ٩،٣ | ٢٣٦٠ |
| فەرەنسا | ٩،٤ | ٢٠٤٣ |
| ئەڵمانیا | ١٠،٣ | ٢٣٦١ |
| نیوزلاند | ٨،١ | ١٤٤٠ |
| نەرویژ | ٩،٤ | ٢٤٥٢ |
| بەریتانیا | ٦،٨ | ١٥١٠ |
| ئەمەریکا | ١٢،٩ | ٤١٦٥ |

تێبینی/ ئەم داتایە بۆ ساڵی ١٩٩٨ ە، ڕێکخراوی OECD بۆ داتای تەندروستی ٢٠٠١ بڵاوی کردۆتەوە.

وەڵامـدانەوەی ئەم پرسـیارانە، لە ڕووی چەنـدایەتی و چۆنـایەتییەوە کـاریگەریی ڕاسـتەوخۆی لەسـەر ژیـانی هەزاران کەس هەیە .

### کوالیتیی ژیان

هەنـدێ لە چارەسـەرە پزیشـکییەکان کـاریگەرییەکی کەمیـان هەیە یـان هەر نییـانە لەسـەر تەمەنـدرێژی بەڵام شێوازی ژیان بەرەو باشتر دەبەن: گۆڕینی جومگەی سمت نمـوونەیەکی لەو جـۆرەیە. یەکـێ لەو کێشـە قـووڵانەی لەبیرکـردنەوە سـەبارەت بە دابەشـکردنی سـەرچاوە تەندروسـتییەکان بەرەو ڕوومـان دەبێـتەوە، چـۆنێتیی بەراوردکـردن و هەڵسـەنگاندنی ڕێژەیـی ئەو کـوالیتییەیە کە ڕاسـتەوخۆ کـاریگەریی لەسـەر تەمەن درێـژی هەیە. مـن نە خۆم لە قەرەی ئەم کێشەیە دەدەم، نە ئەو کێشانەی بە پلەی یەکەم پەیوەسـتن بە پێوەرەکـانی کـوالیتی ژیـانەوە، تەنهـا تەرکیز دەکەمە سەر ئەو چارەسەرانەی کاریگەرییان لەسـەر تەمەن درێـژی هەیە، لەبەرئەوەی لە باسـکردنی دابینکردنـی سـەرچاوەکانی ئەم چارەسـەرانە بە تەنهـا کێشـەی لاوەکـی زۆر هەن.

لێـرەدا دەتـوانین ژمـارەیەکی زۆر نمـوونە بـاس بکەیـن لەسەر درێژکردنەوەی تەمەن. نەشتەرگەریی ڕیخۆڵە کوێرە تەمەن درێـژ دەکـاتەوە، چـونکە بەبـێ ئەم نەشـتەرگەرییە زۆربەی نەخۆشـەکان دەمـرن. دەستنیشـان کردنـی شێرپەنجەی مەمک کاریگەریی لەسـەر تەمەن درێژی هەیە، چونکە دۆزینەوەی خێرای نەخۆشییەکە کاریگەریی لەسـەر

چارەسەری زووترو درێژکردنەوەی تەمەن هەیە. بەرزبوونەوەی فشاری خوێن مەترسیی مردن زیاد دەکات لە ڕێگەی نەخۆشیی نۆرە دڵێ و لێدانی جەڵدەی مێشکەوە، ئەو چارەسەرە فشاری خوێن دا دەگرێت هەرچەندە کۆتایی بە مەترسی نەخۆشەکە ناهێنێ و تەنها کاتییە. شووشتنی گورچیلە بۆ ئەوانەی گورچیلەیان وەکو پێویست کارناکات یان وەستاوە. هەر ساڵێک لە شووشتن ساڵێک درێژە بە ژیان دەدات.

## کۆنترۆڵ کردنی بودجەیەك

وای دابنێ تۆ بەرپرسی خزمەگوزاریی تەندروستیت بۆ کۆمەڵە خەڵکێک لە دانیشتوانی شوێنێک، بودجەیەکی دیاری کراوت لەبەر دەستە. ناتوانیت بەدرێژایی ئەو ماوەیە باشترین چارەسەر بۆ هەموو خەڵکەکە لەئەستۆ بگریت. بڕیارت دا زۆربەی بودجەکەت خەرج بکەیت و چەند سەد هەزار جونەیهێک لەو بوودجەیە ماوەتەوە. تۆ لە گەڵ ڕاوێژکارەکانت دادەنیشی و دەتەوێ ئەو بڕە پارەیەی بۆ خەڵکەکە ماوەتەوە، بە باشترین شێوە خەرجی بکەیت. سێ ئەگەرت لەبەردەمدایەو دەتەوێ یەکێکیان هەڵبژێری. ئەگەرەکانیش ئەمانەن:

١- چارەسەرێکی نوێ بۆ شێرپەنجەی ڕیخۆڵە هەلی چاکبوونەوەی کەمە، بەڵام بۆ تێکڕایی زیادبوونی تەمەنی نەخۆشەکە گرنگە.

٢- دەرمـــانێکی نـــوێ بـــۆ چارەســـەری نەخۆشـــی دڵ داهێنـــراوە ڕێـــژەی مـــردن کەمـــدەکاتەوە، لەو کەســـانەی نەخۆشی کۆلیسترۆڵی بۆماوەییان هەیە.

٣- پـارچەیەکی نـوێ لە کەرەسـتە پزیشـکییەکان دڵنیـایی زیاتر دەبەخشێتە نەخۆش لە کەمکردنەوەی ڕێژەی مردن بە تـایبەتی لە نەشـتەرگەرییە سـەختەکان وەکـو نەشـتەرگەریی مێشک.

لەسەر چی بنەمایەک یەکێ لەم بژاردانە هەڵدەبژێریت؟ یەکێ لەو شێوازانەی زۆرتر بە کارە دەڵێ:

هـیچ هۆکـارێکی ئەوتـۆ نییە بـۆ ئەوەی ژیـانی کەسێک لە کەسێکی تر پەسەندتر لەقەڵەم بدەین، یـان مـافی پێشـینە لەو کەســانەی ســوود لە چارەســەری شــێرپەنجەی ڕیخــۆڵە وەردەگرن بسەپێنین بەسەر ئەوانەی لە ڕووی بۆمـاوەییەوە تووشـی کۆلیسـترۆڵی خـوێن بـوونە، یـان ئەوانەی وەرەمـی مێشـکیان هەیە، لە هەر سـێ کەیسـەکەدا مردنـی پێشـوەختە هەیە، لە هەر چارەسەرێکیشـدا تێکڕایـی تەمەنـی نەخۆشـەکە زیـاد دەکرێت، کەواتە ئەوەی لەسـەرمان پێویسـتە ئەنجـامی بدەین، خەرجکردنی پارەکەیە، لە پێناو " کڕین" ی زۆرتـرین تەمەن بـۆ نەخۆشـەکان، پێویسـتە دادوەرانە سـاڵێک تەمەنـی پڕ شکۆ بۆ هەریەکەیان بە یەکسانی بکڕین، بە چاوپۆشی لە تەمەنی هەر یەکەیان.

### کێشەی دابەشکردن

**تەنـانەت لە نێـو ئەو کەسـانەش کە " وەکـو مـنن " ئەم شــێوازە دەیــانگرێتەوە، لەوێ کێشــەیەک هەیە پێویســتە**

**بەرەنگاری ببینەوە: " کێشـەی دابەشـکردن" لەم خشـتەیەی خوارەوە چاوێک بە هەر سێ دەستوەردانەکەدا بخشێنە.**

| هەڵبژاردنی نێوان سێ دەستوەردان |
| --- |
| دەستوەردانی ١ ١٠ کەس سوودمەن دەبێت تێکڕای بە دەستهێنانی تەمەن ٣٥ ساڵ |
| دەستوەردانی ٢ ١٥ کەس سوودمەند دەبێت تێکڕایی بەدەستهێنانی تەمەن ٣٠ ساڵ |
| دەستوەردانی ٣ ٢ کەس سوودمەند دەبێت تێکڕایی بەدەستهێنانی تەمەن ١٦ ساڵ |

وادایبنێ هەموو ئەم دەستوەردانانە هەمان بڕیان تێدەچێ و ئـێمە تەنهـا توانـای خەرجـی یەکێکیمـان هەیە. هەروەهـا وایدانێ دابەشکردنەکان بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

ئەو دوو کەسـەی سـوودیان لە دەسـتوەردانی ٣ وەرگرتـووە، بـۆ هەریەکێکیـان هەشـت سـاڵ تەمەنیـان زیـاد دەکـات، لەو دە کەسـەی سـوودیان لە دەسـتوەردانی ١ وەرگرتـووە تێکـڕای تەمەنیـان ٣،٥ سـاڵە واتە مەودای ٢-٤ سـاڵ تەمەنیـان زیـاد دەکـات، لە نێـو ئەو ١٥ کەسـەی سـوودیان لە دەسـتوەردانی ٢ وەرگرتـووە، بە تێکڕایـی دوو سـاڵ و بە مەودای ١ تـا ٣ تەمەنیـان زیـاد دەکـات. کەواتە بەرەو پیری کام یەک لەو ٣ دەستوەردانانە بڕۆین؟

ئەگەر باوەڕمـان وابـوو تەمەن بـۆ زۆرتـرین ژمـارەی پێوانەیی بکڕین (بەرزترین ڕێژە) ئەوا پێویستە پارەکەمان لە دەستوەردانی یەکەمدا خەرج بکەین چونکە ٣٥ سـاڵی تەمەن بـۆ ١٠ کەس دەکـڕین. هەنـدێک پێیـان وایە دەسـتوەردانی

دووەم باشترە، چونکە یارمەتی خەڵکێکی زیاتر دەدەین لە جیاتی ١٠ کەس یارمەتی ١٥ کەس دەدەین، هەرچەندە زیادبوونی تێکڕای تەمەنی ئەمان کەمترە. هەندێک کەسیش بژاردەی سێیەمیان پێ باشە، دەستوەردانی ٣ چونکە ئەو دوو کەسەی سوود لە چارەسەرەکە وەردەگرن دەستکەوتی گەورەیان دەبێت ( ٨ ساڵ تەمەنی سەربار)، بەڵام تەمەنی هەر یەکەیان لە ٤ ساڵ تێناپەڕێت. مەسەلەکە ئەوەیە کامیان گرنگە تێکڕایی سالانی تەمەن یان ئەو ڕێگەیەی کە ساڵەکانی تەمەنی لە نێو تاکەکاندا پێ دابەش دەکرێ گرنگە، کە ناسراوە بە "کێشەی دابەشکردن". ئەوانەی بۆچوونە مەزنەکان ڕەتدەکەنەوە بەوەی دەیانەوێ ئەو بالانسە ڕاگرن کە دەیانەوێ زۆرترین کەس سوودمەند بێت. بەڵام ئەو کەسانەی سوودمەند دەبن کەمترین بڕیان لە تەمەن دەست دەکەوێت، پێچەوانەی ئەوانی تر کە زۆر ترین تەمەن بە دەست دێنن بەڵام ژمارەیەکی خەڵکی کەمتر سوودمەند دەبن. بەڵام هەر یەکەیان ڕێژەیەکی زیاتری لە تەمەن بە نسیب دەبێت، بەختەوەرم بەوەی زۆرترین بڕی تەمەن بە دەست بێنم زیاتر لەوەی گرنگی بە دابەشکردن بدەم، هەروەها خۆشحاڵم بەوەی زۆرترین ژمارە سوود لە زیادبوونی تەمەن ببینن زیاتر لەوەی گرنگی بە دابەشکردن بدەم.کاتێ بەشێوەیەکی گشتی خۆشحاڵم بە بەکارهێنانی سەرچاوە دەرمانییەکان لە پێناو زۆرینە کە من خۆم کەمینەم. هیچ سیستەمێکی چاودێری تەندروستی لە جیهاندا نییە لە دوورەوە بەم شێوازە هەڵسوکەوت بکات. یەکێ لە کێشەکانی من " لە پیشاندانی زۆرینە" دەمانگێڕێتەوە بۆ

تۆنی باللیمۆر لە گەشتەکەی بە دەوری گۆی زەویدا. دۆخەکەی من قورساییەکی ئەخلاقی نابەخشێتە ئەوەی پێیدەڵێن " یاسای دەربازبوون" بەڵام بە شێوەیەکی لۆجیکی ئەم یاسایە ڕاستە.

**" یاسای دەربازبوون"**

ئەم یاسایە پەیوەندی بە دۆخێکەوە هەیە ناسنامەی کەسێکی دیاریکراوی تێدایە، کە ژیانی لە مەترسیدایە. دەستوەردانێک بۆ ڕزگارکردنی کەسەکە لە ئارادایە، هەلێکی باش بۆ ڕزگارکردنی کەسەکە، دەڕەخسێ ئەو بە هایەی لە دڵی ئەم " یاسای ڕزگارکردن " ە دایە: ئەمەش ئەو بیانووە ئاساییەیە تا سالانە بۆ ئەم دۆخە پارەی زیاتر خەرج بکرێت، زیاتر لەو دۆخانەی ناسنامەی ئەو کەسە دیاری بکەین کە بەو ئەرکە هەڵدەستێت.

ڕەچاوی دوو دانراوەی تیۆری بکە، بەڵام دوو دانراوی ڕیالیستی لە دۆخەکانی سیستەمی چاودێریی تەندروستی.

**دەستوەردانی A ( ڕزگارکردنی گیانی کەسێکی نەناسراو)**

ئەم دەستوەردانە لەنێو ژمارەیەکی زۆری خەڵکدا، بۆ نموونە لە نێوان ۲۰۰۰ کەسدا، بە ڕێژەیەکی کەم گۆڕانکاری لە کەمکردنەوەی ڕێژەی مردن دەکات. لەم کۆمەڵەیە ئەگەر دەرمانی A بەکار نەهێنرێ ئەوا ۱۰۰ کەس لە چەند سالی کەمی ئایندەدا دەمرن. ئەگەر دەرمانی A بەکار بهێنرێت ئەوا ۹۸ کەس دەمرن، هەرچەندە دەزانین دەرمانی A ڕزگارکەرە

بەڵام نـازانین ژیـانی چـی جـۆرە کەسـێک ڕزگـار دەکـات.

دەرمــانی A هەرزانە، نرخــی بــۆ گلــدانەوەی هەر ســاڵێکی تەمەن ٢٠،٠٠٠ جــونەیهی ئیســـتەرلینییە. نمـــوونەیەک لەم چارەسـەرە پزیشـکییە، چارەسـەری بەرزبـوونەوەی فشـاری خـوێنە. نمـوونەیەکی تـر حەبی سـتاتینەکانە کە کۆلیسـترۆڵی خـوێن دادەگرێـت. داگرتنـی فشـاری خـوێن و کۆلیسـترۆڵی خـوێن ئەگەری مەترسـی ڕوودانـی جەڵـدەی دڵ و جەڵـدەی مێشک کەمدەکاتەوە.

**دەستوەردانی B ( ژیانی کەسێکی ناسراو ڕزگار دەکات)**

B دەرمـانێکی کـاریگەرە بـۆ دۆخێـک کە هەڕەشـەیە بـۆ سەر ژیـان. بە ڕێـژەی زیـاتر لە ٩٠٪ ئەو کەسـانەی تووشـی ئەم دۆخە دەبـن هەلـی مردنیـان زۆرتـرە کە دەرمـانی B وەرنـاگرن، لە مـاوەی سـاڵی داهـاتوودا، بەڵام ئەوانەی ئەو دەرمانە وەردەگرن ڕێژەی چاکبوونەوەیان با بڵێین ٩٠٪ ە.

B نرخــی گلــدانەوەی هەر ســاڵێک ٥٠ هەزار جــونەیهی ئیســـتەرلینییە. شــۆردنی گــورچیلە نمــوونەیەکی ئەمجــۆرە چارەسەرەیە.

ڕەنــگە ســێ جیــاوازی و پەیوەنــدی لەنێــوان ئەم دوو دەســـتوەردانەی A,B دا هەبێــت. یەکەم ئەوەیە B ڕزگـارکەری ژیـانە، بەڵام سـوودەکانی A بـۆ چەنـد سـاڵێک نـاڕوونە. ئەم جیـاوازییە چەنـد گرنگییەکـی ئەخلاقـی هەیە. ئەوانەی سوود لە دەستوەردانی A وەردەگرن پێشـئەوەی سوود لە دەرمانەکە وەرگرن بە هۆکـارێکی تەواو سـەربەخۆ دەمــرن. لەگەڵ ئەوەشــدا کێشــە لە بــڕی تێچوونــدا هەیە،

هەندێ لە تێچوونەکانی دەستوەردان لە گلدانەوەی تەمەن بەهۆی هەڵاوسانی نرخی دراوەوە ڕەنگە وەستا بێت پێشئەوەی سوودەکەی ببینرێت. بە هۆی ئەمەوە، هۆکارێکی ئاشکرا نییە بۆ نرخاندنی ڕزگارکردنی ساڵانی تەمەن لە ئایندەدا، لە ڕزگارکردنی ئێستای ژیان . جیاوازی دووەم لە نێوان هەردوو دەستوەردانەکەدا ئەوەیە B بە دڵنیاییەوە ژیانی نەخۆشە دیاری کراوەکان ڕزگار دەکات بەڵام لە A دا ئەگەرەکە زۆر لاوازە. بەوجۆرە بەجۆرێک لە B دەڕوانرێت کە سوودێکی زۆر بە تاکەکان دەگەیەنێت زیاتر لە A . بۆیە من پێموایە ئەمە هەڵەیە.

جیاوازی سێیەم ئەوەیە دەستوەردانی B سوود لەو کەسانە دەبینێت کە ناسراون. بەڵام لە A دا ڕێژەی ئەو نەخۆشانەی تووشی بەرزبوونەوەی فشاری خوێن دەبن ناتوانین ئەو کەسانە بناسینەوە کە سوودمەندن لە نێو کۆمەڵەکەدا ( هەرچەندە ئەو ڕێژەیە دەزانین چەندە کە سوودمەندن). بە پێی یاسای ڕزگاربوون، لە سیستەمی چاودێریی تەندروستیدا ڕەوایە بودجە بۆ B خەرج بکرێت نەک بۆ A هەرچەندە خەرجی B زۆرترە لە خەرجی A لە گلدانەوەی ساڵی تەمەن بۆ نموونە، بەپێی یاسای ڕزگاربوون هەندێ لە بڕی تێچوونەکان بیانووی هەیە وەکو چارەسەری گۆڕینی گورچیلە زیاتر لە چارەسەر بە ستاتینەکان.

لە پراکتیکدا سیستەمی چاودێری تەندروستیی نیشتمانیی بەریتانی پێڕەوی یاسایەکی تایبەت دەکات. بۆ نموونە بڕی

تێچوونی شووشتنی گورچیله بۆ هەر ساڵێک لە زیادکردنی تەمەن ٥٠ هەزار جونەیهی ئیسترلینییە، بەڵام بەرامبەر پێدانی ستاتین بۆ ئەو کەسانەی کۆریسترۆڵی خوێنیان بەرزە بۆ هەر ساڵێک لە زیادکردنی تەمەنی نەخۆشەکە تەنها ١٠ هەزار جونەیهە. بە واتایەکی تر، ئەگەر بڕی ئەو پارەیەی کە خەرجی دەکەین بۆ شووشتنی گورچیلە، ئەگەر خەرجمان بکردایە لەو کەسانەی کۆلیسرۆڵیان بەرزە ئەوا پێنج بەرامبەر تەمەنی نەخۆشەکان زیاد دەکرا بۆ هەر ساڵێک بەڵام ئێمە ئەوە ناکەین چونکە ئەوانەی پێویستیان بە شۆردنی گورچیلە هەیە، مەحکومن بە مردن؛ لە کاتێکدا حەبی ستاتینەکان کە دەدرێنە نەخۆشەکانی بەرزبوونی ئاستی کۆلیسترۆڵ ڕێژەی مردن تێیاندا خۆی کەمە.

بە هێزترین هۆکاری پشتگیری کردن لە یاسای ڕزگارکردن لە دۆخی ئاساییدا، کەسەکە ناسراوە وەکو تۆنی باللیمۆر، ڕەنگە هەڵێکی زۆری بۆ برەخسێ لە زیادکردنی تەمەندا، بەڵام لە دۆخێکی تایبەتدا کە خۆی لە ڕزگارکردنی ژیانی کەسێکی "ئامارکراوی" نەناسراودا دەبینێتەوە، خەرجکردنی بوودجەیەکی دیاریکراو کاریگەرییەکی کەمی بۆ کەمکردنەوەی ڕێژەی مردن هەیە، چونکە لەو کەسانەدا ڕێژەی مردن خۆی کەمە، هەربۆیە لە بەرژەوەندی یاسای ڕزگاربووندا تا ئەوپەڕی توانام بەرگری دەکەم.

**بەهێزترین گفتوگۆ لە بەرژەوەندی یاسای ڕزگارکردن**

بێگومان مەرگی پێشوەختە زیانێکی زۆر گەورەیە، بەڵام چانسێکی زۆر کەم لەبەردەم مردنی پێشوەختەدا هەیە بە زیانی گەورە نایەتە ئەژمار، تەنانەت ناتوانین بانگەشەی ئەوە بکەین پێویستمان بە بڕێکی زۆر کەم لە هەڵی کەمکردنەوەی مردنی پێشوەختە هەیە. هەموو یەکێک لە ئێمە لە ژیانماندا بازرگانی بە بڕێکی کەم لە زیادبوونی تەمەن لە مەرگی پێشوەختەدا دەکات لە پێناو کەمێک سوودی بچووک. بیهێنە پێشچاو پاسکیل سوارێک لە ڕۆژی یەکشەمەدا .

**پاسکیل سواری لە بەیانییەکی یەکشەمەدا**

لە بەیانییەکی ڕۆژی یەکشەمەدا ، بە درێژی شەقامە قەرەباڵغەکەی بانبوریدا لە ماڵمانەوە لە ئۆکسفۆرد، دەڕۆم بۆ کڕینی ڕۆژنامەیەک بەو کارەم خۆم دەخەمە مەترسییەوە " بە هیوای ئەوەی" سەرباری مەترسییەکی بچووک کە مردنی پێشوەختە، ئەم مەترسییە سەرباره دەگۆڕمەوە بەرامبەر چێژی لاپەڕە- چێژێکی بچووکە لە ژیانما باڵاترە لەو مەترسییە سەربارەی کە مەرگی پێشوەختەیە. دیارە هیچ شتێکی لۆجیکی لەمەدا نییە. هەلێکی کەم هەیە کە زۆر بچووکە بەرامبەر زیانێکی کارەساتبار کە قورساییەکی پاسیڤی هەیە زۆر گەورەترە لەو سوودە کەمەی تر.



**وێنەی(٧) پاسکیلسواری لە بەیانیانی یەکشەمەدا بە ڕێگایەکی قەرەباڵغدا بە مەبەستی کڕینی ڕۆژنامەیەک: مەترسییەکی بچووکی مردن هەیە لە بەرامبەر چێژبینین لە خوێندنەوەی پەڕەکانی ڕۆژنامەیەک.**

زۆربەمان ئەم مەترسییە بچووکانە دەگرینە ئەستۆ، نەک لە بەرژەوەندیی خۆماندا بەڵکو لە بەرژەوەندی هاوڕێکانماندا. ڕەچاوی جیبەجێکردنی ئەرکی هاوڕێکەت بکە.

### جێبەجێکردنی ئەرکی هاوڕێتی

پێویست بوو ئەو هاوڕێیەمان بەرەو کارەکەی بڕوات کە سووربوو لە بەجێهێنانی. بۆ پابەندبوون بە بەڵێنەکەی پێویست بوو ئەمڕۆ لە سەندووقی پۆستە بێت، بەهۆی پەتای ئەنفلوەنزاوە هاوڕێکەم نەیتوانی فریای کارەکەی

بکەوێت. بۆ یارمەتیدانی هاوڕێکەم بە پاسکیل چووم بۆ ماڵیان داواکارییەکەم لێ وەرگرت تاکو بیبەم پۆستی بکەم. جارێکی تر ئەم کارەی من کردم بە بڕێکی کەم مەترسی لەسەر ژیانم زیادبوو، چانسی مەرگی پێشوەختە لەبەردەرگایە. ئەم پێشبینییە لە سەرووی بەهای یارمەتیدانی هاوڕێکەمەوە بوو. واتە لە تای تەرازووی یارمەتیدان و مەرگی پێشوەختە ئەوی دواییان قورسترە.

بە سەرنجدان لەم بابەتە پێشنیارێکم کرد لە بەرژەوەندی سیستەمی چاودێریی تەندروستی لە ڕێگەی پێدان بۆ 'ڕزگارکردن' لە دەستوەردانی جۆری B ( بۆنموونە نرخێکی ٥٠ هەزار جونەیهی ئیستەرلینی بۆ هەر ساڵێکی تەمەنی بە دەست هێنراو) لە گەڵ ڕەتکردنەوەی دەستوەردانی ئاماریی نەناسراو لە جۆری A ( بۆ نموونە نرخی ساڵێک لە گێڕانەوەی ژیان تەنها ٢٠ هەزار جونەیهی ئیستەرلینییە). بەڵگە لەسەر قسەکەم دەرمانی داگرتنی کۆلیسرۆڵ (ستاتینەکان) م وەکو نموونەیەک لەسەر دەستوەردانی ئاماریی نەناسراو، هێنایەوە وە شووشتنی گورچیلەم وەکو نموونەیەک لە دەستوەردانی ڕزگارکردن، داناوە.

ئەوانەی سوودمەندن لە چارەسەری ستاتینەکان، دەستکەوتێکی زۆربچووکە - دابەزینێکی زۆر کەم لە مەترسیی مردنی پێشوەختە. لە بەجێهێنانی وەزیفەی تایبەت بە هاوڕێکەمان وا دەردەکەوێ ئێمە بە ئاسانی سەرکێشی دەکەین بە گۆڕانکارییەکی بچووک لە فرسەتی مەرگی پێشوەختەی گەورە، تەنانەت سوودەکەشی بۆ خەڵکانی ترە. ئەگەر ئێمە خۆمان سوود لە چارەسەری ستاتین وەربگرین(

چونکە ئاستی کۆلیسترۆڵمان بە شێوەیەکی گونجاو بەرزبۆتەوە) ئەوا شتەکە ماقووڵەو هیچ شتێکی سەیرو کاریگەری تیا نییە. ئێمە لای خۆمانەوە پێمان باشە پارەکەمان نەڕوات بۆ دەستهێنانی ستاتینەکان، بەڵکو بە ئاراستەی نرخی شۆردنی گورچیلە بڕوات بۆ ئەو کەسەی ئەگەر گورچیلەی نەشۆررێت دەمرێ. لە دیدی ئەوانەی دەبێت بڕیار لەسەر چۆنێتی دابەشکردنی سەرچاوەکانی چاودێری تەندروستی بدەن، بە دڵنیاییەوە وا باشترە پارێزگاری لە مانەوەی ژیانی خەڵکانێکی کەم بکەن( ئەگەر ئەوە نەبێ ئەوا دەمرن ) لە جیاتی ئەوەی ژمارەیەکی زۆر خەڵک هەلی مردنیان کەم بکرێتەوە لە کاتێکدا مەترسی مردنی پێشوەخت لە سەر ژیانیان ئاستێکی زۆر نزمدایە.

### گەڕانەوەیەکی پزیشکی بۆ کێشەی دابەشکردن

یاسای ڕزگارکردن وا دەردەکەوێ نموونەیەکی تایبەت بێت لە کێشەی دابەشکردن. زۆربەی خەڵک بەرزترین ڕێژەی تەمەنی بەدەست هێنراو ڕەت دەکەنەوە (ئەوانەی بەرژەوەندییان لەوەدایە پارە بدەنە چارەسەری ستاتین) ەکان. لەڕاستیدا بانگی لۆجیکانە بەم شێوەیەی خوارەوەیە: باشتروایە چارەسەرەکان بۆ ئەو کەسانە بن سوودێکی گەورە وەردەگرن (بەردەوامبوونی ژیان بۆ ئەو کەسانەی بە ڕاستی دەمرن) ئەو چارەسەرە لەو کەسانەدا نابێ بەکاربێت کە سوودێکی کەمی هەیە بۆ خەڵکێکی کەم (لە چانسی مردنی پێشوەختە) دا.

**بۆچی لەگەڵ یاسای ڕزگارکردندا نیم**

هەرچەندە بانگەوازی لۆجیکی بۆ یاسای ڕزگارکردن بەهێزە، ئەو بۆچوونانەی من هەمبوون لە بەرژەوەندیی ئەم یاسایەدا بوون، من پابەندم بەوەی زۆرترین سوود بە باش بزانم لە ڕێگەی نموونەیەکی جیاوازەوە بۆ ئەم بابەتە داکۆکی لە هەڵوێستی خۆم دەکەم: نموونەی ئەوەش کەیسی کرێکارە گەمارۆدراوەکەی نێو کانەکانە.

| |
|---|
| **کەیسی کرێکارێکی کانی گەمارۆدراو**<br>**کرێکارێکی کان دوای ڕووداوێک گەمارۆدەدرێت. ئەگەر فریای نەکەون دەمرێت. لە کاتی بوونی تیمێکی فریاکەوتنی گەورە لەوانەیە کرێکارەکە ڕزگار بکرێت. ساتێک تەرخان بکە بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانەی لای خوارەوە:**<br>**١-باوەڕت وایە تۆش پێویستە پەیوەندی بەو تیمەوە بکەیت، ئەگەر بە ڕێژەی ١: ١٠٠٠٠ بەرەنگاری مەترسیی مردن بوویتەوە ؟**<br>**٢- ئایا پێویستت بە هیچ زانیارییەکی سەرەتایی هەیە بۆ ئەوەی وەڵامی پرسیاری یەکەم بدەیتەوە؟** |

ئەگەر وامان دانا خەڵکێکی زۆر خۆنەویستانە ئەگەر تا ڕادەیەکی کەمیش بێت، ئاستی مردنی پێشوەختە سنووردارەکە پەسەند دەکەن، بۆ ئەوەی ژیانی ئەویتر ڕزگار بکەن، وە ئەگەر وامان دانا زۆربەی کەسەکان لە سایەی هەڵبژاردنەکەدا بەپێی توانا ئارەزووی بەرەنگاربوونەوەی کەمترین مەترسیی مردن دەکەن، ئەوا ڕێزگرتن لە ئارەزووی هەر ئەندامێک لە تیمەکەدا ئەم

دەرەنجامەی دەبێت. ڕێزگرتن لە توانای ئەندامانی تیمە ڕزگارکەرەکە لە ڕێگەی پێکهێنانی تیمێکی گەورە، بەمەبەستی ڕزگارکردنی کرێکارێکی کانی گیرخواردوو، لەسەر حیسابی گیانی خەڵکێکی زیاتردەبێت.

بەمجۆرە ئەگەر بەشێوەیەک لە مەسەلەکەمان ڕوانی کە تەنها مەسەلەی باڵانسی نێوان مەترسیی ژیانی هەر ئەندامێکی تیمەکەیە بەرامبەر بە سوود گەیاندنێک لە لایەن ئەندامانی تیمەکەوە، ئەوا بەشێوەیەکی گشتی ڕاستترە بڵێین شوێنکەوتنی سیاسەتێکین زۆر گران لەسەرمان دەکەوێت لە زیانە گیانییەکان.

وایدابنێ ئەفسەرێکی باڵای سووپا سەرکردایەتی پرۆسەی ڕزگار کردنەکە دەکات، ئەنجامی چاوەڕوانکراو ئەوەیە خەڵکێکی زۆر دەمرن لە هەوڵی ڕزگارکردنەکەدا زیاتر لەوەی ڕزگاری دەکەن. ئەوکاتە ئەفسەرەکە سەرکۆنە دەکرێت و دووچاری ڕەخنە دەبێتەوە، تەنانەت ئەگەر ئەندامانی تیمەکە لەو کەسانە بن خۆبەخشانەو بە ویستی خۆیان مەترسییەکەیان پەسەند کردووەو زانیویانە ژیانیان لە مەترسیدایە.

ڕەنگە ئەفسەرەکە بەرپرس بێت لە پرۆسەی ڕزگارکردنەکە کە بووەتە هۆی مردن لەڕیزی ئەندامانی تیمەکە زیاتر لەو کەسانەی ڕزگار کراون، سەرکردایەتی کردنی ئەم جۆرە ڕزگارکردنە تەنانەت لە دیدی خۆبەخشەکانیشەوە، نموونەی کێشەیەکی گەورەو پرۆسەیەکی شکستخواردووە، لە ڕووی ئەخلاقییەوە.



وێنەی(٨) تیمی تایبەتی ڕیان: پێویستە کەسانێکی زۆر ژیانیان بخەنە مەترسییەوە بۆ ڕزگارکردنی تەنها یەک کەس؟

**چەند زانیارییەکی تری سەرەکی**

با بگەڕێینەوە بۆ پرسیاری دووەم سەبارەت بە کەیسی کرێکارە گیرخواردووەکە: پێشئەوەی وەڵامی پرسیاری یەکەم بدەیتەوە، ئایا تۆ پێویستت بە زانیاری سەرەکیی زیاتر هەیە؟ باوەڕم وایە دەبێ ئەوە بزانیت نەک تەنها مەترسی شەخسی لە پەیوەندی کردن بە تیمەکەوە هەیە ، بەڵکو لە ڕووی قەبارەی تیمەکەشەوە مەترسی هەیە. چونکە ئەگەر تیمە ڕزگار کەرەکە پێویستی بە ١٠ کەس بێت هەر ئەندامێک مەترسیی ١: ١٠،٠٠٠ ڕێژەی مردنی هەبێ، ئەوا ژیانی کرێکاری کانەکە ڕزگار دەکرێت بێئەوەی هیچ کەسێک گیان لە دەست بدات. بەڵام ئەگەر ئۆپراسیۆنی ڕزگار کردنەکە پێویستی بە ١٠٠ هەزار ئەندام هەبوو ئەوا خەڵکێکی زۆر لە پرۆسەی ڕزگارکردنی کرێکارە

گیرخواردووەکەدا گیان لە دەست دەدەن. دیارە من زۆر دڵخۆشم ( لە دیدی ئەخلاقییەوە) بە تیمی ڕزگارکردنی یەکەم بە بەراورد لە گەڵ دووەمدا.

## گەڕانەوە بۆ چاودێریی تەندروستی

ڕێگە بدەن با چاوێک بخشێنینەوە بە ستاتینەکان و شۆردنی گورچیلەدا. ڕوون نییە ئایا ئەوانەی سوودیان لە دەستوەردانی ئاماریی نەناسراو وەرگرتووە( وەکو ستاتینەکان) بە ویستی خۆیان دەستبەرداری چارەسەرەکەیان دەبن لە پێناوی ئەو کەسانەی نەخۆشییەکەیان قورسترە تا چارەسەرە گرانبەهاکە وەرگرن بە مەبەستی درێژکردنەوەی تەمەن. ئەو سیستەمەی چاودێری تەندروستی کە هەموو ساڵێک لە پێناوی تەمەنی بە دەستهێنراو پارە خەرج دەکات ( وەکو شۆردنی گورچیلە) زیاتر لە چارەسەرە ئامارییەکان. سیستەمی چاودێریی تەندروستی کاریگەرە بۆ ئەوانەی سوود لە چارەسەری خۆپارێزی وەردەگرن تا بەشداربن لە ئاهەنگی ڕزگارکردنی ئەو کەسانەی لە چارەسەری ڕزگاربووندا بە ڕاستی پێویستیان پێیەتی. بە هۆی سنووردارکردنی سەرچاوەکان، پێویستە لەسەر هەر سیستەمێکی چاودێری تەندروستی لە دەمی بڕیاردانا سەبارەت بە چارەسەرەکان کە تەمەن درێژ دەکەن و ژیانی هەندێ کەس ڕزگار دەکەن لەسەر حیسابی کەسانێکی دی، بەڕای من پرەنسیپی بنەڕەتیی پێویستە ئەو بڕیارانە بن کە ئەوپەڕی ساڵانی تەمەن زیاد دەکەن نەک کەم. تەنانەت ئەگەر بڕیاردەرێکیش هەبوو ( وەک نەبووە) کە مایەی

پرســیارە، وەکـو ئەو ئەفســەرەی ســووپا کە ڕێبەرایەتــی کۆمەڵێک خۆبەخشی دەکرد، بەڵام ئایا ڕەوایە لە سیستەمی چــاودێری تەندروســتیدا کەســێکی زۆر بمــرن لە پێنــاو ڕزگارکردنی کەسانێکی کەم؟.

**ئەنجامێکی ناڕوون**

ئایا دەتوانین ئەم دەرەنجامە ناڕوونە پەسەند بکەین؟ با بگەڕێینەوە بۆ ڕزگارکردنە درامییە سەرکەوتووەکەی تۆنی بــاللیمۆر کە تێیــدا هێزەکــانی بەرگــری ئوســتڕالیا بە پرۆســەیەکی ڕزگــارکردن هەســتان. مەگەر کەســێک زۆر دڵـڕەق بێـت بەسـەرهاتەکەی تـۆنی بـاللیمۆر بخـوێنێتەوەو بڕیـار بـدات لەســەر ئەوەی ئەو ئۆپەراسـیۆنی ڕزگـارکردنە ئۆپەراسـیۆنێکی هەڵە بـووە. هێزەکـانی بەرگـری ئوسـتڕالیا لەسەر حەق بوون کاتێک ملیۆنەها دۆلاریـان لەو پرۆسـەیەدا خەرجکرد. بە هەمان شێوەش هەڵە نییە ئەگەر لە کۆمەڵگەدا سـاڵانە بـڕی ٥٠ هەزار جـونەیهی ئیستەرلینی خەرج بکرێـت بـۆ پرۆســەی شووشـتنی گـورچیلە. چـۆن دەتـوانین هێنـد دەستەوەســتان بــین لە ڕووی ئەخلاقیــیەوە بە نەخۆشـێک بڵێین: دەتـوانین تەمەنـت بـۆ چەنـد سـاڵێک درێـژ بکەیـنەوە، بەڵام پــارەی پێویســت بــۆ ئەو مەبەســتە خەرج نــاکەین، پــرۆژەی گرنگترمــان لە پێشــە، یــان کەســە نزیکەکانیــان نائومێدو بێبەش بکەین.

دیـارە ئەم دۆخە زۆر جیـاوازە لە دۆخـی ئەو نەخۆشـەی کۆلیســترۆڵی خــوێنی بڕێــک بەرزبــۆتەوە، ڕەنــگە بە بــێ چارەســــەر تووشــــی جەڵــــدەی دڵ نەبــێ و نەمرێــت. بە لێگـرتنەوەی چارەسـەر بڕیـاری مردنمـان بە سـەریدا نەداوە،

چونکە شووشتنی گورچیلەکە زۆر پێویستترە. ڕاستە ئەگەر چارەسەری کۆلیسترۆڵەکەمان ڕاگرت، لە ئەنجامی ئەو بڕینەوە، نازانین ئەو کەسانەی دەمرن کێن. بەڵام ئەو کەسانەی لە شۆردنی گورچیلەکەدان دەیانناسین.

بەهەمان شێوە لۆجیکی دۆخی کرێکاری کانەکە کە گیری خواردووەو ژیانی لە مەترسیدایە، بە هەمان شێوە لە پێشترە لە دانی چارەسەر بەو نەخۆشەی کۆلیسترۆڵی بەرزە، ڕاستە نازانین کێ لەو کەسانە بە نۆرە دڵی دەمرێ یان نامرێ، بەڵام کرێکارەکە ناسراوەو مردنی مسۆگەرە.

### فراوانکردنی خەیاڵی ڕەوشتی

چۆن بازنە بگۆڕین بە چوارگۆشە؟ لە هاوسۆزیمان بۆ تۆنی باللیمور یان ئەو کەسەی گورچیلەی وەستاوە چی فێر دەبین؟ بە ڕای من وەڵامەکە ئەوەیە نابێ ئێمە لۆجیکی و گەرموگوڕو پڕ جۆشوخرۆشبین لەولاشەوە لە هەوڵی ڕزگارکردنی باللیمۆر و کەیسی وەستانی گورچیللەدا خۆمان بە دوور بگرین.

ڕاستتروایە سۆزی مرۆڤ بوونمان و هەستی ئەخلاقی خۆمان بە ئاگا بێنینەوە. ئەوەی کە پێویستە لە کەیسی کرێکاری کانە گیرخواردووەکەوە فێری بین ئەوەیە، دەبێ ویژدانمان بەرامبەر خەمی قووڵی ئەو کەسانەی تیادەچن بجووڵێنین، دەبێ لە نائومێدی و بێبەشبوونی کەسانی نزیک یارمەتی دەر بین، دەبێت جیاوازی لە نێوان کەیسی بەرزبوونەوەی کۆلیسترۆڵ و کەیسە مەترسیدارەکاندا بکەین. ئێمە ناڵێین ئەوانەی دەمرن و نایانناسینەوە، گیانیان بێ نرخە، چاودێری تەندروستی لە ڕێگەی دارایییەوە

بەهایەکی نوێیە بۆ مرۆڤ. ئەو وانەیەی پێویستە فێری بین لە هاوسۆزیمان بەرامبەر ئەو کەسانەی پێویستیان بە ڕزگارکردن هەیە، فراوان کردنەوەی خەیاڵی مۆراڵیی ئێمەیە. ئێمە هاوشانی ئەو کەسە دەوەستین و پاڵپشتی دەکەین کە کارەساتێکی لێ قەوماوە، لە ڕێگەی دابین کردنی پارەوە، تا ژیانی لە مردن ڕزگار بکەین. بەهەمان شێوە پشتگیری ڕزگارکردنی ئەوانەش دەکەین لە مردنی (ئاماری) دا ڕیزیان بەستووە. چونکە ئەمجۆرە مەرگە نەناسراوە، ئەو کەسە نەناسراوانەن، ئەو مرۆڤە ڕاستەقینانەن، ئەو دۆست و هاوڕێ و کەسانەن بە هەمان شێوە شین و شەپۆڕو خەمو کەسەر لە دوای خۆیان بەجێ دێڵن.

## بەشی چوارەم
## ئەو کەسانەی بوونیان نییە؛

### یان بەلای کەمەوە هێشتا بوونیان نییە

وردەکـــارترین فەیلەســـووف لەو فەیلەســـووفانەی لەم بـــارەیەوە گەورەتـــرین تێگەیشـــتنیان هەبـــووە ( ڕۆحیـــان هاوشـــێوەی لێکـدانەوەکانیان پـێچەوانەیە) زۆر بە جیـددی مەخلوقێکمـــان پیشـــان دەدەن لە شـــێوەی مـــرۆڤ[٤] ( HOMUCULUS) ... ڕەنــگە ســـوودمەند بـــێ، ڕەنــگە پێکرابـــێ، ڕەنــگە دادوەر بـــێ؛ بە کـــورتی ڕەنــگە هەمـــوو

---

٤ نمـــوونەی مرۆڤێکـــی قەزەمـــی ئەفســـانەیی بچـــووککراوە، لە ئەفســـانەو ڕۆمانەکانی سەدەکانی ڕابردوودا وەکو غۆل چاوی لێکراوە، ڕەگی ئەم گیانەوەرەی هاوشێوەی مرۆڤە بۆ فۆلکلۆرو نەریتە ئەلکیمییەکانی ڕابردوو، (سەدەی شازدەهەم دەگەڕێتەوە). (وەرگێڕ).

داواکـــاری و مـــافه مرۆییەکـــانی هەبێــت، وەکــو تــۆللی، پۆفندرۆف، یان باشترین نووسەرەکانی بواری ڕەوشتناسی.

لەم دۆخ و پێودانگەوە چیرۆکی ڕەوشتە پزیشکییەکانی پــێش دووگیــان بــوون ســەرهەڵدەدات. بەڕای تریســترام شاندی[٥] کەسایەتییەک دروست دەبێ ژیان پێی دڵخۆشە، لە ڕێگەی فکرو خەیاڵی دایک و باوکێکەوە شکڵگیر دەبێت و لە ڕێگەی جووتبوونەوە دێتە بوون. تریسترام بە گازندەوە دەڵێ: هیوادارم دایکم یان باوکم یان هەردووکیان لە ڕاستیدا، چونکە لە خزمەتەکەدا هەردووکیان بە هەمان بڕ پابەندبوون بەوەی بیر لە دروستکردنی من بکەنەوە، ئایا وەکــو پێویســت بەرامــبەر ئەو ئەرکەی ئەنجامیــان دا پشتبەســتوو بــوون بە ڕەچــاوکردنی ئەوەی لەو کــاتەدا پێویســتە - لێرەدا مەسەلەکە تەنها تەرکیزکــردنە ســەر بوونەوەرێکی ئەقڵانی نییەو بەس، بەڵکو فۆرم و پێکهاتەی شــادی و بەختەوەریــی، پــلەی گەرمیــی جەســتەی، بلیمەتییەکەی، تاقم و تەختەکانی ئەقڵی: تەنانەت

---

٥ ژیان و دیالۆگی قارەمانی ڕۆمانەکەی لۆرینس ستێرنە، ئەم ڕۆمانە هەر بەناوی "تریسترام شاندی"یەوە، لە نۆ بەرگدا بڵاوکراوەتەوە، ساڵی ١٧٥٩ دوو بەرگی لێ بڵاوکراوەتەوە، حەوت بەرگەکەی تریشی لە ماوەی حەوت ساڵی دواییدا بڵاوکراوەتەوە.. وەکو ژیاننامەی کەسێتییەک ناسراوە. ستێرن باکگراوندێکی دەوڵەمەندی هەیە بۆ گەیشتن لە ژیانی تاکەکان، تریسترام لەسەر دەستی دوکتۆرێکی مامانی پیاوەوە دوکتۆر سلۆپ، دێتە دونیاوە، بە مەقەستە ئارترییەکەی دەستی لە کاتی ڕاکێشانی کۆرپەکەدا، لووتی تریسترام دەقرتێنێ و وەکو منداڵێکی شێواو لە مناڵدانی دایکی دەریدێنێ، کارەساتەکە لێرەوە سەرچاوە دەگرێت، بەڵام منداڵێکی بلیمەت دەردەچێ (وەرگێڕ).

ئەوەی پێچەوانەکەی بزانن، لە کەرەستەکانی ناو ماڵ ڕۆڵیان هەیە لە یاریکردن و گەمەو زەوق و ڕەفتار هەموو ئەمانە ئەو کاتە لە سەری سەرەوە بوون...

- *دوعا بکە ئازیزەکەم، بڵێ دایکەکەم، لە بیرت ناچێ کاتەکە تەواو بێت؟*

- *زۆر باشە جی-* باوکم بە سەرسووڕمانەوە هاواری کرد، بەڵام لە هەمان کاتدا ئاگاداری ئەوە بوو دەنگی دەرنەچێ.

- *ئایا هەموو ژنی لەسەرەتای دونیاوە بە پرسیارێکی پڕوپووچ قسە بە پیاوێک دەبڕێ ؟*



وێنەی(٩) پێویستە پزیشکەکان بزانن چی لە دەوریان دەگووزەرێ کاتێک یارمەتی ژنێکی دووگیان دەدەن.

دەستەی ژنانی دووگیان و کۆرپەلەزانی HFEA لە مرۆڤدا لە ساڵی ١٩٩٠ لە بەریتانیا پێویستی بەوە بوو:

پزیشکەکان کاتێک چارەسەری ئافرەتێکی دووگیان دەکەن، دەبێ بزانن چی لە دەوریان دەگوزەرێ. بە پێی دەقی یاساکە: « نابێ خزمەتگوزاری تەندروستی و چارەسەری ئافرەتی دووگیان بکرێت، ئەگەر ڕەچاوی خۆشگوزەرانیی منداڵەکە نەکرابێت کە لە ئەنجامی وەرگرتنی چارەسەرەوە لە دایک دەبێت- لە نێو ئەوانەشدا پێویستیی منداڵەکە بۆ باوکێک»...

کاتێ ژنێکی بەریتانی تەمەن ٥٩ ساڵ لە سک وزا وەستاو دەچێتە کلینیکێکی ئیتاڵیا بۆ مەبەستی سک وزا کردن ( لە ڕاستیدا دوای ئەوە دوانەیەکی دەبێ)، ئەم هەواڵە لە ڕۆژنامە بەریتانییەکاندا هەرایەکی زۆری نایەوە). بیر لەو منداڵانە بکەرەوە بەو شێوەیە لە دایک دەبن، کاتێ هاوڕێکانیان لە ڕێگەی قوتابخانە چاویان پێیان دەکەوێت دەبنە مایەی گاڵتەجاڕی کاتێک دەبینن لەلایەن دایکێکی زۆر بە تەمەنەوە هێنراونەتە دونیاوە.

بەپێی وتەی ئەندامێک لە دەستەی پیتاندن و کۆرپەلەزانی (کە چاودێری کلینیکەکانی پیتاندن) دەکات، گرنگیدان بە خۆشگوزەرانی منداڵ لە دوای لە دایکبوونیان، چارەسەری ژنانی سکپڕی بە تەمەنی ڕەتکردۆتەوە.

خۆشگوزەرانی بۆ منداڵان زۆر گرنگە بەهۆی بیرکردنەوە ڕەوشتییەکەوە بە ڕادەیەک واتای HFEA کێشەمان لە گەڵی نییە: بە لام مەسەلەکە بەو شێوەیە نییە. کاتێ بیر لەیارمەتی ژنێکی دووگیان دەکەینەوە، بیر لە خۆشگوزەرانی منداڵەکە لە داهاتوودا ناکەینەوە، چونکە

خۆشـگوزەرانیی منـداڵەکە پەیوەنـدیی بە داهـاتووەوە هەیە، ئەگەر هەر بە ڕاسـتی لە داهـاتوودا منـداڵێکی لەو شـێوەیە بـوونی هەبـێ. لەمەوە ڕوون دەبێـتەوە ڕەچـاوکردنی خۆشـگوزەرانیی منـداڵ لە داهـاتوودا، لە ڕاسـتیدا وەکـو کرپارێکی ون و نادیار ڕەفتاری لەگەڵ دەکرێت.

**هاوشێوەیی لە هەڵگرتنەوەی منداڵدا**

هەر لە ڕۆژەکانی یەکەمی- پیتاندن لە تاقیگە (IVF) دا- ئەو تەکنیکەی بیرۆکەی منداڵی بلوری بەڕێوە دەبرد، ناوی ژنێکی مانچیستەرییان لە تاقیگەی پیتاندنی IVF دا لە لیستی چاوەڕوانیدا سڕییەوە، کە تۆمـارێکی تاوانکـاری هەبـوو بە تـۆمەتی گـلان بە کـاری داوێـن پیسـییەوە. نەخۆشـخانەکە سیاسـەتی تـایبەت بە خـۆی هەبـوو ( ئەمە دوو سـاڵ پـێش ئەوەی HFEA یاسـای تـایبەت بەخـۆی هەبێت). دەقـی ئەم سیاسـەتە ئەوەیە ئەو هاوسـەرانەی ئـارەزووی پیتانـدنی دەسـتکردیان هەیە «پێویسـتە ڕەچاوی پێوەرە گشـتییەکانی ڕێکخراوەکـان بـکەن کە لە گەڵ ڕووداوە ئاسـاییەکانی هەڵگرتنەوەی منداڵدا بگونجێت».

کـاریگەریی ئەم سیاسـەتە لەوەدایە هەر کەسـێک داوای پیتاندنی دەستکرد بکات و وەکو بـاوک گونجـاو نەبوو، ئەوا پێویسـتە ئەو ژنە هاوکـاری نەکرێـت لەدروسـتکردنی کـۆرپەلەدا، پێویسـتە ئەم سیاسـەتە پشـت بەو بیـرۆکەیە ببەسـتێ کە خۆشـگوزەرانی بـۆ داهـاتووی منـداڵەکە دابـین دەکـات. بەڵام ئایـا ئەم لێکچـوونەی نێـوان بەخێـوکردن و یارمەتیدانی پیتاندنی کۆرپەلە شتێکی ڕاستە؟

لە کەیسی بەخێوکردنی منداڵدا منداڵێکمان هەیە X ڕەنگە ژمارەیەک دایک و باوکی هەڵگرەوەی منداڵمان هەبێ وەکو : A,B,C,... وای دابنێ بیانوویەکی باشمان بە دەستەوەیە کە باوکو دایکی A باشترن لە دایک و باوکی B,C,.... ،باوەڕ وایە منداڵی X ژیانی خۆشتر دەبێت، ئەگەر A مان هەڵبژارد زیاتر لەوانی تر. پێویستە بڕیاری باشترین کوالیتی بۆ باوک و دایک لە لایەن بریکارەکانی بەخێوکردن و هەڵگرتنەوەی منداڵەوە بێت. ئێمە بە پێی ئەو بڕیارە کە لە بەرژەوەندی منداڵەکەدایە کاردەکەین ئەویش پێدانی منداڵی X ە بۆ باوکودایکی A




وێنەی (١٠) پیتاندنی کۆرپەلە لە پرۆسەی منداڵی بلووریدا

ئێستا ئەم دۆخە بەراورد بکە لەگەڵ ئەو هاوکارییەی پێشکەشدەکرێت بۆ دروستکردنی منداڵی بلووری. گریمان هاوسەرەکانی A,B,C..تاد، هاتوون بۆ بە دەستهێنانی

یارمەتی لە چارەسەرکردنی پیتاندندا. هەموو ئەم هاوسەرانە وەکـو یەک پێرفێکـت و مـاقوولن، بەلام ئـێمە هۆکـارێکی باشـمان لەبەردەسـتە باوەڕمـان وایە بـاوکودایکی A ئەو خەسڵەتانەیان تێدایە ببنە باشترین دایک و باوک لەوانی تر. یـارمەتی کـام دایـک و بـاوک بـدەین؟ ئایـا دەکـرێ ئەگەر هاوسەرانی A مان بۆ منداڵەکە هەڵبژارد لەسەر ئەو بنەمایە بتوانین حوکم بدەین منداڵەکە زۆر بەختەوەر دەبێت ئەگەر لای دایکوباوکی A بێت، یان بڵێین کەپڵی A باشترە لەوانی دی؟.

ئەوەی مـن بیـزانم لە هـیچ مەملەکەتێکـدا شـتەکە هێنـد ئاسان نییە بۆ منداڵ چاوەڕوانی ئەوە بن بۆ کۆمەڵێک دایک وبـاوک تەرخانیـان بـکەن. ئەگەر یـارمەتی دایکوبـاوکی A بدەین بۆ وەچە خستنەوە ئەوا منداڵێک دێتە بوون کە منداڵی A یە ئەگەر یارمەتی B مان دا ئەوا منداڵی B دێتە بوون . بە چـی پێوەرێـک بەرژەوەنـدی منـداڵەکە هەڵسـەنگێنین بـۆ داهـاتوو؟ ئەگەر یـارمەتی B مـان دا ئەوا منـداڵی B دێـتە بوون، سەرەتایەکی باشی لە ژیان هەیە بەلام وەکو کوالیتی A نابێت. ئەگەر پارەمان دابینکرد بۆ یارمەتیدانی یەکێک لەو دوو کەپڵە دەبێ کامیان هەڵبژێرین، ئەگەر تـاکە پێوەرمـان ئەوەبێ لە بەرژەوەندی منداڵەکە جووتێکیان هەڵبژێرین ؟.

شتێکی فریودەرانەیە ئەگەر بڵێین بەرژەوەندی منداڵەکە لە میـانەی یارمەتیـدانی کەپڵـی A ەوە بە دەسـت دەهێنرێـت. بەلام ئەمە شـتێکی هەڵەیە. منـداڵێکی جیـاواز پشـت بەو دایکوبـاوکە دەبەسـتێ ئـێمە یارمەتییـان دەدەیـن، ڕەنـگە بەرژەوەنـدیی بـالای منـداڵەکە لەوەدا بێـت کەپڵـی A هەڵبژێـرین، بەلام لە بەرژەوەنـدیی منـداڵی B دایە یـارمەتی

کەپلی B بدرێ. ئەگەر تەرکیزمان خستە سەر بەرژەوەندیی ئەو منداڵەی لە داهاتوودا بوونی هەیە، ئەوا ئەو پرسیارەی دەبێ بکرێ: ئایا ئەم بەرژەوەندییانە بە شێوەیەکی باش خزمەت دەکات ئەگەر کورەکە یان کچەکە کۆرپەی ئەو دایکوباوکە بن یان هی ئەوان نەبن؟ پرسیارەکە بەم شێوەیە تەواو نامۆیە تا ئەو رادەیەی داوامان لێدەکات بەراورد لە نێوان بوون لە گەڵ نەبووندا بکەین، رەنگە باشترین پرسیار ئەوە بێت: ئایا گرەنتی هەیە منداڵێک لە داهاتوودا بۆ ئەم ژن و پیاوە پێشبینییەکی ماقووڵی لێ بکرێت بەوەی شایستەی ژیان بێت؟ لە بەشی داهاتوودا دەگەرێمەوە سەر ئەم جۆرە مەسەلانە. خاڵی بنەرەتیی ئەم دیبەیتەمان ئەوەیە " رەنگە لە داهاتوودا منداڵی دایکو باوکێکی تر ( رەنگە باشتر) بێت، کە هێشتا دروست نەبووە. ئەمە ئەو خاڵەیە بە شێوەیەکی یەکلاکەرەوە هاوشێوەیی لە بەخێوکردندا شکست پێدێنێ.

ئەگەر پارەمان تەرخانکرد بۆ یارمەتیدانی تەنها یەک کەپڵ ئەوا بێ دوو دڵی جووتی A هەڵدەبژێرین، وە ئەو منداڵەی بوونی هەیە منداڵی A ە (پێشبینی) دەکرێ بەختەوەرترین منداڵ بێت بە بەراورد لە گەڵ منداڵی B. ئەمە ئەگەر هۆکاری تر نەبێت پەیوەندیی بە هەڵبژاردنی دوو کەپڵی جیاوازەوە هەبێ، باشتروایە بەو رێگەیە هەڵسوکەوت بکەین بتوانین بەختەوەرترین منداڵ دروست بکەین، لەم دۆخەدا راستتروایە بوونی منداڵێکی بەختەوەر بە دەست بێنین بە یارمەتیدانی کەپڵی A. ئەگەر بژاردەکەمان کەپڵی A بوو، بەڵام لەجیاتی ئەو یارمەتی کەپلی B مان دا. ئەوا بۆ ئایندە، دژی بەرژەوەندیی منداڵەکە

ڕەفتارمـان کـردووە. هەڵبژاردنمـان بـۆ کەپڵـی A لەسـەر بنەمـای- باشترین شـوێنی جیهانە. ئەو منداڵەی دێتە بـوون واتە A لەو باشـترین جیهـانەدا چێـژ لە خۆشـترین ژیـان وەردەگرێت، بەبەراورد لە گەڵ منداڵی B ئەگەر یارمەتی B مان دا لە باشترین بەرژەوەندی تاکەکاندا.

ئەکرێ ئەم خاڵە بەهێزتر بکەین لە ڕێگەی ڕەچاوکردنی ئەم هاوشـێوەییەی خـوارەوە. گریمـان نەخۆشـخانەیەک نەشتەرگەرییەکی نـاکتوپڕ دوا دەخـات بۆ داخلبوونی هۆڵی نەشتەرگەری، تـاکو نەشتەرگەرییەکی خێراو کتوپڕ ئەنجام بـدەن. کەس داکـۆکی لەوە ناکـات، بەرژەوەنـدیی بـاڵای نەخۆشـی یەکەم لەوەدایە نەشـتەرگەرییەکەی دوابخرێـت. بەپـێچەوانەوە ئەمە بە دژی بەرژەوەنـدییەکانی ئەو دێـتە ئەژمـار. پاسـاو هێنـانەوە بـۆ ڕەفتـارکردن دژی بەرژەوەنـدییەکانی ئەم، ئەو نەخۆشـەیە کە پێویسـتی بە نەشتەرگەریی خێرا هەیە، لەبەرئەوەی ئەم کەیسە پێویستی بە بڕیاردانە، بۆیە بڕیارەکە لە بەرژەوەندی ئەو ژنە دەدرێت کە پێویستی بە نەشتەرگەریی خێرایە.

وادیـارە ئـێمە پاسـاوی بیـانووی لـۆجیکی یەکەممـان دۆزییەوە لە کاتی یارمەتیدانی کەیسی وەچە خستنەوەکەدا، ئەوەمان زانی پێویستە یارمەتی کەپڵی A بدەین لە جیاتی C، B، تـاد. ( بە گریمـانەی ئەوەی داهاتەکەمـان تەنهـا بـۆ یەک کەس دەبێت). ئەم پاساوهێنانەوەیە پشت ئەستوور نییە بە بیرۆکەی ڕەفتارکردن لە بەرژەوەندیی باڵای منداڵەکە کە دێتەبـوون، پشـت بە سیاسـەت و ڕێنماییەکـانی سـەنتەری پیتانـدن و کـۆرپەلەزانی HFEA یـان نەخۆشـخانەی سـانت ماری لە مانچیستەر نابەستێ، بەڵکو پشت بە بیرۆکەی ئەو

پاساوهێنانەوەیە دەبەستی کە فەراهەم کردنی باشترین ئاستی خۆشگوزەرانییە بۆ منداڵەکە: ئێمە پێویستە بەپێی توانا لەپێناو خولقاندنی منداڵی بەختەوەردا ڕەفتار بکەین. ئایا پێویستە پاساوەکان جیاواز بن ئەگەر بڕیارەکە هەمان بڕیار بێت؟ وەڵام بەڵێ بەوشێوەیەیە لەڕووی پراکتیک وتیۆرییەوە.

Adoption

A B C D

Couples wanting to adopt: Couple A will make better parents than couples B, C, D, etc.

baby 'x'

It is in baby x's best interests to be adopted by couple A.

Assisted reproduction

A B C D

Couples wanting to be helped: Couple A will make better parents than couples B, C, D, etc.

The babies who will exist if we help A, B, etc.

a b c d

If we help couple B, baby b will be born. If we help couple A, baby a will be born. Baby a is a different person from baby b.

شێوەی(١١)هاوکاریکردن بۆدروستکردنی منداڵی بلووری یان هەڵگرتنەوەی منداڵ.

**بەراورد کردنی بوون لەگەڵ نەبووندا**

لە پێشدا گریمانەی ئەوەمانکرد دەتوانین تەنها هاوکاری کەپلێک بکەین لە کەپلەکانی ...,A, B, C تاد. بەڵام زۆر جار دۆخەکە بەو شێوەیە نییە. ژنە تەمەن ٥٩ ساڵەکە کە چوو بۆ ئیتاڵیاو لە سەر خەرجی خۆی بە جمکانە سکی کرد. سەنتەرەکە لەنێوان ئەوو ژنێکی تردا پێویستی بەوە نەبوو هەڵبژاردن بکات. هاوارو زەنای ڕۆژنامەنووسانی بەریتانیش لەسەر ئەوبنەمایە نەبوو هاوکاری کەسێک دەکرێ و کەسێکی تر ناکرێت، یان کەسێک بە پەسەندتر دەزانن لەویدی. تووڕەییەکە لەسەر بنەمای بەرژەوەندیی منداڵەکە بوو ( بۆنموونە هەر منداڵێک ڕەنگە لە دایک بێت)، ئەگەر تەرکیزمان خستە سەر بەرژەوەندی منداڵەکە ئەوا پێویستە هاوکاری دایکەکە بکرێت لە پیتاندنی کۆرپەلەکەی. ئەو پرسیارەی دەبێ بیکەم: ئایا بەرژەوەندیی منداڵەکە ئەگەری باشترین خزمەتگوزاریی هەیە لە لایەن باوک و دایکەکەوە ئەگەر بە تەمەن بوون؟ ئەمە پرسیارێکی زۆر سەیرە. ئایا ماقووڵە بەراوردی بوون لە گەڵ نەبووندا بکەین؟ هەندێ وتیان ئەم بەراوردکردنە وەکو دابەشکردنی ژمارەیەکە بەسەر سفردا. لە یەکەمیاندا شتەکە لۆجیکییە، بەڵام ئەرکێکی بێمانایە. هەندێکیش ڕایان وایە منداڵەکە ژیانێکی ترسناکی نییە، لەبەرئەوەی منداڵەکە باشترین بەرژەوەندیی لە بووندایە، لەسەر ئەو بنەمایەی (بوون) بە شێوەیەکی گشتی کارێکی پۆزەتیڤانەیە. لەوانەیە یەکێکی وەکو مۆنتسکیۆ دیدێکی ڕەشبینانەی پێچەوانەی هەبێ سەبارەت بەم بوونە وەکو ئەزموونێکی نەرێنی چاوی لێ بکات.

ئەگەر ئەوانەی دەڵێن ناتوانرێت بەراوردی بوون لەگەڵ نەبووندا بکرێت، ئەگەر بوون لە نەبوون باشتربێت، ئەوا پێوەری بەرژەوەندیی باڵای منداڵەکە پڕوپووچ و بێمانایە. بەڵام ئەم ڕایە ڕووبەڕووی تەنگوچەڵەمە دەبێتەوە. گریمان لە مشتومڕێکدا: ئەگەر کەپڵی ل منالێک بێنن ئەوا منداڵەکە ( ڕەنگە بەهۆی دۆخێکی بۆماوەیی تۆقێنەرەوە) تووشی ئازار و زیان بێت، تا دوایی منداڵەکە بەدەم ئازارەوە دەمرێت، بۆ پشووی یەکجاری لە تەمەنی یەک ساڵی دەمرێ، واتە ئەم منداڵە تەمەنی ساڵێک لە ئازاری بەردەوام، دوایش مردن بووە، لەم هەلومەرجانەدا ڕەنگە ڕەوا بێت ئەگەر بڵێین یارمەتی دانی کەپڵی ل شتێکی هەڵە بووە بۆ وەچەخستنەوە، لەسەر ئەم بنەمایە نموونەی ئەم منداڵە و هاوکاری کردنی تا بێتە دونیاوە، دژیْ بەرژەوەندی ئەو منداڵەیە کە بوونی هەیە.

ڕەنگە تێگەیشتن لەم حوکمە پێویستی بەوە نەبێت ( ژمارەکە دابەشی سفر بکەین). لە ڕێگەی تەمەنەوە مرۆڤ دەتوانێ بە شێوەیەکی گشتی بپرسێ ئایا ئەم ئەزموونە ئەزموونێکی نەرێنی هەبووە یان ئەرێنی. هێڵی سفر لێرەدا بە واتای ژیانی سەرەوەی سفر دێت، ژیانی سەرەوەی سفر کە کەسێکی دیاریکراو بەشێوەیەکی گشتی لەسەری دەژی، شایستەی ژیانە بەڵام ژیانی ژێر سفر شایستەی ژیان نییە، لێرەوە دەتوانین بڵێین ژیانی ئەو منداڵەی کە کەپڵی ل دروستیان کردووە، بە شێوەیەکی گشتی لە ژێر سفرەوە بووە. لەبەر ئەم هۆیە لە بەرژەوەندیی منداڵەکەدایە لە دایک نەبێت. بە پێی ئەم وتەیە لە بەراوردی کێشەکاندا پشت بە بوون و نەبوون نابەستین، بەڵکو لەسەر توانای بڕیاردان

لەسەر پێشبینی کردنی ژیان، ئایا بە شێوەیەکی گشتی لە ژێر سفرەوەیە یان لەسەرووی سفرەوەیە( وەکو لەسەرەوە باسکراوە).

ئەو پاساوەی هێنایانەوە بۆ ئەوەی بڵێن، هاوکاری کردنی ژنێکی ٥٩ ساڵان، دوای نەمانی بێنوێژی و دابڕانی لە سک و زا ئەوە دژی بەرژەوەندییەکانی منداڵەکەیە، شکستی هێناوە بە چاوپۆشین لەو بیرو باوەڕەی سەبارەت بەم کێشەیە گیراوەتە بەر.

١-ئەگەر بەراورکردنی بوون لەگەڵ نەبوون شتێکی لۆجیکی نەبێت، ئەوا لۆجیکی نییە بڵێین هاوکاری کردنی ژنێک بۆ وەچە خستنەوە پێچەوانەی بەرژەوەندییە ڕەواکانی منداڵەکەیە. لە سایەی ئەم بۆچوونەوە مرۆڤ ناتوانێ پاساو بۆ هەر شتێک بێنێتەوە لەسەر بنەمای بەرژەوەندیی باڵا، چونکە لەم دیدەوە مانای نییە بەراورد بکەین لە نێوان بەرژەوەندیی دیار و بەرژەوەندیی نادیار.

٢- لە لایەکی ترەوە ئەگەر حوکمدان لەسەر ئەوەی بوون لە بەرژەوەندی منداڵەکەیە (بوونی لەئایندەدا) و ئەگەر ئەو حوکم دانە پەیوەندییەکی بنەڕەتی بە ژیانی پێشبینی کراوەوە هەبێت بە شێوەیەکی گشتی ئەزموونێکی پۆزەتیڤە، کەواتە پرسیارەکە کە دەبێ وەڵام بدرێتەوە ئەمەیە: ئایا بە گشتی پێشبینی ژیانێکی پۆزەتیڤ دەکەیت بۆ منداڵێک کە لە ژنێکی ٥٩ ساڵەوە لە دایک بووە؟

ئەگەر وەکو من لە دۆخێکی خراپدا بیت، بە دیدێکی تاریکەوە بۆ مەسەلەی بوونی منداڵەکە دەڕوانیت، ڕەنگە باوەڕت وابێ ئەم بوونە لە بەرژەوەندیی منداڵەکە نییە، یارمەتی ژنە بەتەمەنەکە بدرێت بۆ سک کردن. حوکمدان

لەسەر ئەوەی بوون لە بەرژەوەندی منداڵەکەیە ناتوانێ ئەو تووڕەییە بڕەوێنێتەوە، کە دژی یارمەتیدانی ژنێک بێت کە دەمێکە سووڕی مانگانەی بەسەرچووەو لە تەمەنی نائومێدی دایە، بۆ ئەم جۆرە کەیسانە ئەرکی سەرشانی ئەو کەسانەیە کە ئەم جۆرە دیدەیان هەیە گفتوگۆ بکەن لەسەر ئەوەی ڕێگە نەدەن یارمەتی هەموو هاوسەرەکان بدرێت بە مەبەستی پیتاندنی کۆرپەلە. ئەو دیدەی کە زۆر ڕەوایەو هاوسەنگیی ڕاگرتووە ئەوەیە دووچار بوونی منداڵەکە لە قوتابخانە بە گاڵتەپێکردن و تەنگ پێهەڵچنینی وا دەکات منداڵەکە بەختەوەر نەبێت، بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین ژیانی دۆزەخێکە بۆ خۆی. ئەوە دادگایە بڕیار دەدات ئایا لە بەرژەوەندیی منداڵەکەیە ڕێگەی پێبدرێ بمرێت، لە جیاتی ئەوەی چارەسەرێ بۆ بکەن تا تەمەنی درێژ بێ، یان نا. پێوەری زۆر بەرزیان دانا: پێویستە ژیانی ئەو منداڵانە زۆر خراپ بێت. تاکو دادگا بڕیار بدات ئایا مردن لە بەرژەوەندیی منداڵەکەیە یان نا. ئەو پاساوانەی دژی ئەو ژنانەی کە دوای نەمانی سووڕی مانگانە، یان تەمەنی نائومێدی منداڵیان دەبێت نابێت هاوکاری بکرێن. لەسەر ئەو بنەمایە بوو ئەو منداڵەی لە ڕێگەی چارەسەرەوە درێژە بەژیان دەدات، وەکو ئەو منداڵە نییە لە چارەسەرکردندا کە دایکێکی گەنجی هەیە. بەڵام وەکو باسمان کرد، ئەم مەسەلەیە پەیوەندی بە باشترین بەرژەوەندیی منداڵەکەوە نییە کە دێتە بوون ئەگەر هەستاین بە یارمەتیدانی ژنێکی بە تەمەن. منداڵی ژنە بە تەمەنەکە بوونی وەکو بوونی ئەو منداڵە نییە کە ژنەکە گەنج بێت.



وێنەی(١٢) ئایا دەکرێت ژنێکی بە تەمەنی ٥٩ ساڵە کە کاتی سک و زای بەسەرچووە هاوکاری بکرێت بە شێوازی دەستکرد (منداڵی بلووری) منداڵی ببێت؟

**کردەی پارێزگاری لە ناسنامەو کاریگەریی لەسەر ناسنامە**

جیاوازییەکی بنەڕەتی لەم گفتوگۆیەوە سەرهەڵدەدات: ئەویش لە نێوان بڕیاری پارێزگاری لە ناسنامەو کاریگەری لەسەر ناسنامە. نموونە لەسەر ئەو کردەوانە، پارێزگاری لە ناسنامە ئەوەیە کاتێ ژنی سکپڕ بڕێکی زۆر لە کحول دەخواتەوە. خواردنەوەی مەی لەم نموونەیەدا کاریگەری لەسەر ناسنامەی کۆرپەلەکە نییە، بەڵکو لەسەر تەندروستی کۆرپەلەکەیە. ئەگەر لە ئەنجامدا بەکۆمەڵێک زیان لە مێشکدا

کـۆرپەلەکە لە دایــک بـــوو بەهـــۆی خـــواردنەوەی مەیەوە لەلایەن دایکەکەوە، ئەوا کۆرپەکە زیانی بەرکەوتووە.

نموونەیەک لەو کارەی کاریگەریی لەسـەر ناسـنامە هەیە ئەوەیە کاتێ دایکەکە لە مندڵبوون دوا دەکەوێ بۆ نموونە لە تەمەنی ٣٠ ساڵی بۆ ٤٠ ساڵی ئەوا منداڵێکی جیاواز لە دایک دەبێــت لە ئەنجــامی ئەو دواکەوتـــنەوە کاتێــک دکتۆرێــک هاوکاری وەچەخستنەوە دەکات و کەپڵی A هەڵدەبژێرێت لە جیاتی B ئەوا بڕیارێک دەدات کاریگەریی لەسـەر ناسـنامە هەیە.

ئایا کـاریگەریی سروشـتی ناسـنامە لە کارێکـدا بەسـەر ڕەوشـــتی ئەو کـــارەوە چیـــیە؟ ئەمە ئەو پرســـیارەیە بـــۆ یەکەمجـار لە چوارچێـوەی شـیکردنەوەی بنەڕەتیـی تیـۆری ئەخلاقیدا خراپە بەرباس. ئەمە پرسـیارێکە لای پزیشـکەکان گرنگیی خۆی هەیە.

**کێشـــەی بـــێ ناســـنامەو ئەو دەســـتوەردانەی کـــاریگەریی لەسەر ناسنامە هەیە**

دێرێک پارفیت[6] ئەم مەســـەلەیەی بە کێشـــەی بێ ناســـنامە نـــاوبردووە، کێشـــەکە لە ڕێـــگەی بەکارهێنـــانی نمـــوونەی " کچێکی ١٤ ساڵەوە " باس دەکات. نووسیویەتی:

ئەم کـــچە هەڵبژێـــردرا کە ســـک بکـــات. چـــونکە خـــۆی منـــداڵێکی هەرزەکـــار بـــوو ئەوا ئەو منـــداڵەی دەبێـــت سەرەتایەکی خراپی دەبوو لە ژیاندا. هەرچەندە منداڵەکە بە

6 Derek Parfit

درێژایی ژیانی کاریگەرییەکی خراپ لە سەر ژیانی دەبوو بەڵام وەکو پێشبینی دەکرا شایانی ئەوەبوو ژیانێکی شایستە بژێت. بەڵام ئەگەر کچەکە چەندساڵێکی تر چاوەڕوان بووایە، ئەوا منداڵێکی جیاوازتری دەبوو، سەرەتایەکی باشتری دەبەخشییە ژیانی.

گریمان هەوڵماندا کچەکە ڕازی بکەین تا چاوەڕوان بێت« پێویست ناکات تەنها بیر لە خۆت بکەیتەوە بەڵکو بیر لە مناڵەکەشت بکەرەوە، چونکە ئەگەر ئێستا منداڵت ببێ دۆخی منداڵەکە زۆر خراپ دەبێت، بەڵام ئەگەر لە دواییدا منداڵت ببێ ئەوا سەرەتایەکی باش چاوەڕوانی دەبێت» . شکستمان هێنا لە ڕازی کردنی کچەکە. ئایا لەسەر حەق بووین کە وتمان بڕیارەکەی بەرامبەر منداڵەکەی خراپە؟ ئەگەر چاوەڕوانی بکردایە، ئەوا بە دیاریکراوی ئەم منداڵەی نەدەبوو کە سەرەتایەکی خراپی هەیە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شایستەی ژیانە. ... « ئەگەر کەسێک بە ژیانێکی شایستە بژێت بەراورد بەکەسێک کە هێشتا بوونی نییە ئایا ئەو ژیانە خراپە؟» پێویستە وەڵامەکەمان نەخێر بێت ... کاتێک ئەمە دەبینین، ئایا ڕای خۆمان بگۆڕین سەبارەت بەم بڕیارە؟ ئایا واز لەو بڕیارە بێنین کە وتمان باشتر وایە کچەکە چاوەڕوان بێت تاکو یەکەم منداڵی سەرەتایەکی باشی لە ژیاندا هەبێت؟... ناتوانین سووربین لەسەر ئەوەی ئەم بڕیارەی کچەکە خراپترین بڕیارە سەبارەت بە منداڵەکەی. پاساومان چییە بۆ بڕیارەکەی کە داویەتی؟ لەم پرسیارەوە کۆمەڵێک ئەنجامی جیاواز بوونی هەیە. لەبەر ئەوە ئەم کێشەیە ناو دەنێم کێشەیەک لە نەبوونی ناسنامەدا.

نمــوونەکەی بارفیــت کۆمەڵێــک مەســەلەی وروژانــد، پــێچەوانەی کێشــەی نەبــوونی ناســنامە، کەمترینیــان لە بەرژەوەندی کچەکە خۆیدا نییە. دەمەوێ ئەو مەسەلانەی تر بخەمە لایەکەوە، لە چوارگۆشەی لاپەڕەی داهاتوودا هەندێ هەڵوێســتی پزیشــکیی ســەربار پێشــکەش کــراوە کێشــەی نەبــوونی ناســنامەی تیــا خــراوەتە ڕوو لە هەمــوو ئەم دۆخانەدا دەتوانین بڵێین، باشتر وایە ئەگەر بڕیار درا ببێتە هۆی لە دایکبوونی هەر منداڵێک، ڕاستتر وایە ژیانێکی باشتر بژێــت. ڕەنــگە ئەم باســە پشــت بەســتووبێت بە بیــرۆکەی ئەوپەڕی خۆشــــگوزەرانی تەواو. لەگەڵ ئەوەشــــدا لە هەر دۆخێکدا نـاکرێ باسـەکە پشـت بە بەرژەوەنـدی منداڵەکە ببەستێ. نابێ پێشبینی ئەوە بکەین بڕیارەکە هەرچییەک بێت لە هەر ســێ دۆخەکەدا منــداڵە لە دایکبــووەکە لە ســایەی بڕیارەکەوە زەرەرمەندبووەو ئازاری پێگەیشتووە.

مەسەلەی نەبوونی ناسنامە کاریگەرییەکی گەورەی هەیە لەســەر ئەوەی پێویســتە دکتۆرەکــان چــی بــکەن. ئەگەر پزیشکێک ویستی کارێک بکات وەکو نووسینی دەرمانێک لە دەمی دووگیانیدا کە زیان بە کۆرپەلەکە بگەیەنیت، ئەم زیـان گەیاندنە هۆکارێکی باشە بۆ ئەوەی دوکتۆرەکە دەرمانەکە ڕەت بکــاتەوە، تەنــانەت ئەگەر ژنەکەش خــۆی ویســتی و چارەســەرێکی گونجــاویش بێــت. ڕەچەتەی ئەم دەرمــانە نمــوونەیەکە لە ســەر پارێزگــاری لە ناســنامە. بەڵام ئەگەر هەوڵی پزیشکەکە کاریگەری خراپی لەسەر "ناسنامە" هەبوو و بــووە هــۆی لە دایکبــوونی منــداڵێکی کەم ئەنــدام، هــیچ منــداڵێک بەو ڕادەیە کەم ئەنــدام نابێــت وا بەهــۆی ئەم

ڕەچەتەیەوە تووشبووە، پێویستە ئەو هەوڵانە ڕابگیرێن. لەو کۆمەڵگەیانەی قورساییەکی زیاتر دەبەخشنە سەر سەربەخۆیی نەخۆش و ویستی وەچەخستنەوە، پزیشکەکان بە شێوەیەکی گشتی بۆیان نییە بەسەر ویست و بژاردەی ژنەکەدا بازبدەن بەو مەرجەی کەس زیانی بەرناکەوێت؛ ئەو بڕیارانەی کاریگەریی لە سەر ناسنامە هەیە، بەڵام هیچ کەسێک زیانی بەرناکەوێت (ئەگەر کەم ئەندامییەکە بە ڕادەیەک بەهێز نەبێت کە تەندروستی منداڵەکە شایستەی ژیان نەبێت) شێوەی ئەم دەرەنجامە دژبەری لۆجیکی سروشتە، لێرەوە بۆم دەردەکەوێ لۆجیکی سروشت هەڵەیە: ئەگەرپشتی بە میتافیزیکە هەڵەکان بەستبێت.

---

**سێ نموونەی کلینیکی سەبارەت**
**بە کێشەی نەبوونی ناسنامە**

**١-تێستی جینەکان پێش پیتاندنی کۆرپەلە**

**دۆخی گریمانەیی ( hypothetical ) یەکەم : "کەڕکردنی کۆرپەلەیەک ". کەپڵێک- بە بۆماوەیی خۆیان کەڕن، دەیانەوێ منداڵێکیان ببێ ئەویش وەکو خۆیان کەڕ بێت، بۆ ئەوەی ببێتە بەشێک لە "کۆمەڵگەیەکی کەڕ" . ژنەکە دووگیان دەبێت. تێستی جێنەتیک دەریدەخات کە کۆرپەلەکەیان لە ڕووی جیناتەوە ئاساییەو کەڕ دەرناچێت: وەکو هەر منداڵێکی ئاسایی تر. گریمان دەرمانێک هەیە ئەگەر ژنە دووگیانەکە وەریگرت ئەوا کۆرپەلە تۆرماڵەکەی کەڕ دەبێت. بەڵام هیچ کاریگەرییەکی تری نەرێنی لەسەر کۆرپەلەو دایکەکە نابێت. جووت**

هاوسەرەکە بریاری ئەوە دەدەن، پێویستە ژنەکە ئەم دەرمانە وەربگرێت تا منداڵەکەی بە کەڕی لە دایک ببێت.

(آ) ئایا لە ڕووی ڕەوشتییەوە ئەم ژن و مێردە لە بژاردەی وەرگرتنی دەرمانەکەدا هەڵەن ؟

(ب) ئایا دکتۆرەکە هەڵەیە گەر لەسەر داواکاری ژن و مێردەکە دەرمانەکەی نووسی؟

(ج) ئەگەر دایکوباوکەکە دەرمانەکەیان وەرگرت و منداڵەکەیان کەڕ بوو، ئایا منداڵەکە دەتوانێ سکاڵانامەیەکی یاسایی ئەخلاقی دژی دایکوباوکەکە یان دژی دوکتۆرەکان بەرزبکاتەوە؟

بە بۆچوونی من زۆربەی خەڵکی وەڵامیان بۆ هەر سێ پرسیارەکە "بەڵێ" دەبێت. ئێستا ڕەچاوی ئەم گریمانەیەی لای خوارەوە بکە.

دۆخی گریمانەیی دووەم: هەڵبژاردنی "کۆرپەلەیەکی کەڕ". ئەمجارە دوو هاوسەرە تووشبووەکە لە ڕووی بۆماوەییەوە، دەیانەوێ منداڵەکەشیان بە هەمان شێوە بەڕێگەی جینەکان کەڕ بکەن، لە کاتی هاوکاری کردنیان بە وەچەخستنەوە. ژمارەیەک کۆرپەلەیان بە ڕێگەی دەستکرد دروست کردووە، بەشێوەی IVF دەیانەوێ (لە ڕێگەی تاقیگەوە سپێرمەکە ئەو هێلکەیە بپیتێنێ کە هەڵگری جیناتی کەڕبوونە). کۆرپەلەی A لە ڕووی بۆماوەییەوە نۆرماڵە. کۆرپەلەی B هەڵگری (جینەکانی کەڕبوونە) بەڵام تەواوی جینەکانی تر هیچ کێشەیەکیان نییە. دوو هاوسەرەکە دەیانەوێ کۆرپەلەی B هەڵبژێرن کە بەجیناتی کەڕبوون پیتێنراوە سەرەنجام منداڵێکی کەڕیان پێ دەبەخشرێ: منداڵی B . ( ئەگەر تۆ ڕەچاوی ئەوەت کرد دۆخی کۆرپەلەکە دۆخی ئەخلاقیی کەسێکە، هەڵبژاردنی نموونە جیاوازەکە سەبارەت بە هێلکەکە شتێکی

تره، جیاوازە لە دۆخی کۆرپەلەکە).
(آ) ئایــا ژن و پیــاوەکە لە هەڵبژاردنــی کــۆرپەلەی B لە ڕووی ڕەوشتەوە تاوانبارن لە جیاتی ئەوەی لە پیتاندنەکەدا A هەڵبژێرن ؟
(ب) ئایــا دوکتۆرەکــان تاوانبــارن بەوەی ڕازیبــوون بە داواکاریی ژن و مێردەکە؟.
(ج) ئایا منداڵیB مافی ئەوەی هەیە سکاڵانامەی یاسایی ئەخلاقــی دژی دایــک و بــاوکی یــان دژی دوکتۆرەکــان بەرزبکاتەوە؟

لە دیمەنــی یەکەمــدا وا دەردەکەوێ دایــک و بــاوکەکە تاوانبــارن لە هەڵبژاردنــی "کەربــوونی" منداڵەکەیان لە کاتێکدا دەیانتوانی منداڵە ساخ وسەلامەتەکە هەڵبژێرن کە دەبیستێ، دوکتۆرەکــانیش تاوانبــارن کە ڕێگەیــان بەو هەڵبــژاردنە دا. هۆکــاری ســەرەکی ئەوەی وای کــردووە ئەم کــارە هەڵە بێت ئەوەیە ئەم هەڵبــژاردەیە زیــانی بە منــداڵەکە گەیانــدووە. بەڵام ئەمە راســت نیــیە، چــونکە هەڵبژاردنــی هەر کــۆرپەلەیەک بــۆ پیتاندن، هەڵبژاردنی کاریگەری ناسنامەیەکی تایبەتە بەو تۆو و هێلکەیە(بروانە دەقەکە).

### ٢- دواخستنی دووگیانی

ژنێکی تەمەن – ٣٥ ساڵ، زۆر دەمێک بوو بە هیوای ئەوە بــوو ببێــتە دایــک، بەڵام نەک ئێســتا. بەڵکــو دەیویســت منداڵبوونەکەی دوابخــات تــاکو چــوار ســاڵەکەی زانکۆ تەواو دەکات و بەشداری خوولی دەرچوون دەکات، خۆشــی دەیزانــی ڕەنــگە لەو کــاتەدا منــداڵەکەی تووشــی شــێواویی لە جینــاتە جەســــــتەییەکان بێــــت. وەکــــو نیشــــانەکانی داون (Dowmsyndrome) (بە پێــی ئەم نیشــانانە ژمــارەی کرۆمۆسۆمەکان زیاد دەکەن، لە جیاتی ٤٦ کرۆمۆسـۆم دەبێتە ٤٧ کرۆمۆســۆم. گەشــەی ڕووخســارو جەســتەی منــداڵەکە

دوادەکەویت. زۆر منـدال ڕادەی تێگەیشـتنیان و فێربوونیـان زەحـمەت دەبێـت).   ئەم ژنە داوای لە دوکتـۆرەکەی کردبـوو حەبی منال نەبوونی بۆ بنووسێت، ئەویش بۆی دەنووسـێ بۆ ماوەی سێ سال و نیو ئەو حەبە بەکار دێنێ، دوای ئەوە سک دەکات منداڵێکی دەبێ نیشانەکانی داونـی هەڵگرتووە. ئایا ئەو دوکتۆرەی حەبی سکنەکردنی بۆ ئەو ژنە نووسیوە زیانی بە منداڵەکە گەیاندووە؟

## ٣- چارەسەری عازەبە یان زیبکەی هەرزەکاری

عـازەبە، دۆخـێکە تووشـی پێسـت دەبێـت بە تـایبەتی لە هەرزەکارەکانـدا بـۆیە پێیـدەڵێن زیـبکەی هەرزەکـاری. تایبەتمەنـدییەکە لە قـنجکە و لەکەو مـێخەکە بە ڕوخسـاری گەنـجەکەدا بلاودەبێتەوە. زۆربەی هەرزەکارەکـان بە سـووکی تووشـی زیـبکەی‌هەرزەکـاری دەبـن بەڵام هەنـدێکیان بە شێوەیەکی قورس تـووش دەبن. زیبکەی هەرزەکـاریی قـورس ئەگەر بە بێ چارەسەر مـایەوە، ئەوا ڕەنـگە ببێتە هـۆی چاڵ و شـێوەی کـون و جێـی بـرین  لە ڕوخسـاردا، جـگە لەوەش کێشەی دەروونی دەخوولقێنێ، باشـترین چارەسـەری کـاریگەر بۆ زیپکەی قورس چارەسەرێکە بەنـاوی Isotretinoin یەکێ لە کـاریگەرییە لاوەکیـیە نەخوازراوەکـانی ئەم چارەسـەرە ئەوەیە: دەبێـتە هـۆی لە نـاوبردنی کـۆرپەلە ئەگەر لە کـاتی دووگیانیدا ئەم چارەسەرە بەکاربهێنرێت، یـان ڕەنگە منداڵەکە لە دایـک بێـت بەڵام ڕوخسـاری شـێواو یـان بەدشـێوە دەربکەوێت، یان تووشی کێشەی شێواوی لە دڵ ببێتەوە.

لە بەر کـاریگەریی بە جێهێشـتنی ئەم شـوێنەوارە نەخـوازراوە لەسـەر کـۆرپەلە ئەوا سروشـتییە نووسـینی ئەم دەرمـانە بۆ چارەسـەری ئەو زیبکەیە، لەلایەن پزیشکەکەوەوە بە کـارێکی هەڵە دابنرێـت، تەنـانەت ئەگەر ژنەکە بە ویسـتی خـۆی داوای دەرمـانەکە بکـات. چـونکە زیـان بە کـۆرپەلەکەی

دەگەیەنێت، یان بە تێکڕایی ئەو منداڵەی کە لە کۆرپەلەکەوە دروست دەبێت.

لە هەلومەرجێکدا ئەگەر نەخۆشەکە دووگیان نەبوو، بەڵام لە کاتی وەرگرتنی دەرمانەکەدا دووگیان دەبێت، کەواتە پێویستە دوکتۆرەکە چی بکات؟ ئەو ئامۆژگارییەی پێویستە دوکتۆرەکە بیداتە نەخۆشەکە ئەوەیە: پێویستە ئەو دوکتۆرانە کاتێک Isotretretinoin بۆ ئەو نەخۆشانە دەنووسن، تەنها ئەو کاتە دەینووسن کە نەخۆشەکە کە بە گرەنتییەوە دووگیانییەکەی دوادەخات. تەنانەت دوای وازهێنان لە دەرمانەکەش نابێ دووگیان بێت. لە هەندێ باروودۆخدا پێویستە دوکتۆرەکە ئەم چارەسەرە ببەستێتەوە بە حەبی دژە سکپڕییەوە.

لەم پێوەندییەوە دەتوانین بڵێین ڕاستتروایە دکتۆرێک ئایزۆتریتینوین بۆ ژنێک بنووسێ کە دووگیان نەبێت، پێویستە دڵنیا بێت لەوەی دووگیانییەکەی دواخستووە، تەنانەت دوای وەرگرتنی کۆرسێک لە ئایزۆتریتینوین پێویستە ( بۆ ماوەی شەش مانگ تا ساڵێک) نابێت دووگیان بێت. بەڵام کاتێک دڵنیا نییە لەوەی دووگیانییەکەی دواخستووە بە هەڵە دێتە ئەژمار، ئەگەر ئەو دەرمانەی بۆ بنووسرێت. ئەمەش بۆ ئەو مەبەستەیە ئەگەر ئەو ژنە دووگیانییەکەی دوا نەخات ئەوا زیان بە منداڵەکەی دەگات. ئێستا با بە دۆخێکی جیاوازتر لە مەسەلەکە بڕوانین، ئەگەر ژنەکە دووگیان بوو و منداڵەکە کەمئەندام بوو، بەهۆی ئەوەی دووگیانییەکەی دوانەخستووە، ئەوا ناتوانین بڵێین لە ئەنجامی ئەوەدا زیان بە منداڵەکە گەیشتووە لە بەرئەوەی دووگیانییەکەی دوانەخستووە. چونکە ئەگەر دووگیانییەکەی دوابخستایە ئەوە هەر لە بنەڕەتەوە ئەو منداڵە کەمئەندامەشی نەدەبوو.

بژاردەی ژنەکە لەو ویستگانەی کە هیچ کەسێک زیانی پێناگات؛ لەو رەفتارو بڕیارانەی کە کاریگەریی لەسەر ناسنامە هەیە هیچ کەسێک زیانی پێناگات( ئەگەر کەم ئەندامییەکە بە جۆرێک نەبوو کە ژیانی منداڵەکە بەشێوەیەکی گشتی شایستەی ئەوە نەبێ کە بژێت).

لەم دەرەنجامەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ ئەمجۆرە بیرکردنەوەیە پشتبەستووە، بە دۆخێک لە سروشتی میتافیزیکیی هەڵە، یان چەند هەڵەیەکی میتافیزیکی.

# بەشی پێنجەم
# سەندووقی بیرکردنەوە

*دی کوینسی[7]، لە (نووسراوەکان ژمارە یازدە، ٢٢٦) وەلامێکی مەردانەی تۆمارکردووە: پیاوێک لە دیبەیتێکی ئەدەبی یان ئاینیدا، پڕەداتە پەرداخێک شەراب و دەیکاتە سەروچاوی پیاوێکی خانەداندا، قوربانییەکە هیچ خۆی تێک نەداو بە تاوانبارەکەی وت: گەورەم ئەمە لادانە لە بابەتەکە، تکایە با ئێستا بگەڕێینەوە سەر ئەسڵی مەسەلەکەی خۆمان. ( نووسەری ئەم وەلامە بەهێزە دوکتۆر هیندرسۆن[8] بوو، بێئەوەی هیچ یادەورییەکی تر لە دوای خۆی بە جێ بێلێ: جگە لەم وتە نەمرو پڕواتا جوانە، ساڵی ١٧٨٧ لە ئۆکسفۆرد کۆچی دوایی دەکات).*
*(جی.ل. بۆرخیس[9]، هونەری بەدگۆیی، ١٩٣٣)*

---

7 Thomas De Quency

-دی کوینسی (١٧٨٥- ١٨٥٩) نووسەرو وتارنووس و ڕەخنەگرێکی ئەدەبی ئینگلیزی بووە، "دانپیانەکانی پیاوێکی ئالوودەی ئەفیون" یەکێکە لە شاکارە بە نرخەکانی تۆماس دی کوینسی، لە ماوەیەکی زۆر کورتدا ئەم نووسراوە، لە شێوەی ئۆتوبایۆگرافی یان ژیاننامەی تایبەت بەخۆیدا لە شەوو ڕۆژێکدا ناوبانگی ڕۆیشت. زۆربەی زانایان، پێیان وابوو ئەم بەرهەمەی دی کوینسی ڕێخۆشکەر دەبێت بۆ ڕەواداان بە نەریتی ئالوودەبوون بە مادەی هۆشبەر لە ڕۆژئاوادا. (وەرگێر).

٨ئەم دوکتۆرە وەکو کەسایەتییەکی زانستی کە پاشخانێکی ئەفسانەیی شاراوەی هەیە لە نێوەندە زانستییەکاندا وتە بەنرخەکانی دەگێڕرێنەوە بەلام هیچ سەرچاوەیەکی ئەوتۆ لەبەردەستدا نییە، بوونی ئەم کەسایەتییە پشتی پێ ببەستێت، هەرچەندە دەیان کلینیک و نەخۆشخانەو ناوەندی زانستی ناوەکەی ئەوی هەڵگرتووە.

٩جۆرج لویس بۆرخیس (١٨٩٩- ١٩٨٦)، لە بوینس ئایرس لە دایکبووە، لە ١٩١٤ لەگەڵ خێزانەکەیدا بەرەو سویسرا کۆچ دەکەن. لە کۆلێژی دی

به بۆچـــوونی مـــن ڕەوشـــتی پزیشـــکی نەزمـــێکە لە لێپرســـینەوە و کـــاردانەوەیەکی ڕەخنەگـــرانەیە. پزیشـــک و پەرســتار و پیشــەوەرە تەندروســتییەکانی تر، بە شـێوەیەکی ئاسـایی بیرۆکەی باشـیان هەیە سـەبارەت بەوەی ئەنجـامی دەدەن. دەبەنگییە ئەگەر ئاگات لەوەنەبێت ئەوانەی لە ڕووی پـراکتیکییەوە کارەکـان ئەنجـام دەدەن پێیـان وابێت تەنهـا خۆیـــان ڕاســـتن. بەڵام ڕۆڵـــی فەلســـەفە لەوەدایە داوای هۆکارەکـــان دەکـــات، هۆکارەکـــان ملکەچـــی شـــیکردنەوەو شرۆڤەو ڕەخنەی ورد دەبنەوە. سوکرات خۆی وا دەبینـێ، مێشەکەرانەی ئەقڵە زرنگەکانە، تووڕەیی بـارودۆخی ئێسـتا، بە پرسیارە ڕووشـکێنەکان دەورووژێنن. پێویسـتە بەردەوام پیشـەی پزیشـکی بەرەو پێشـەوە هەنگـاو بنێت، ئەویـش لە ڕێگەی پشـکنینی بەردەوامەوە لە هەردوو بـواری زانسـتی و فەلسـەفییەوە. زانسـت دەپرسـێ، بەڵگە چییە لەسـەر ئەوەی ئەمە باشـترین چارەســـەرە؟ مەودای کـوالیتی ئەم بەڵـگەیە

---

جنێڤ دەخوێنێ، بەشێوەیەکی بەرفرەوان ئەو خێزانە ئەوروپا دەگەڕێن لە نێویاندا ئیسپانیا. لە گەڕانەوەیدا بۆ ئەرجەنتین لە ١٩٢١، شیعرو وتارەکانی لەگۆڤـــارە ئەدەبیـــیە ســـورپالییەکاندا بڵاودەکـــاتەوە، لە ١٩٥٥ دەبێـــتە بەڕێـوەبەری کتێبخـانەی گشـتیی نیشـتمانی، هەروەهـا دەبێتە مامۆسـتای ئەدەبی ئینگلیـزی لە زانکـۆی بـوینس ئـایرس، لە تەمەنـی ٥٥ سـاڵی کوێر دەبێت. لە شەسـتەکان بەشـێوەیەکی بەرفراوان بەرهەمەکانی لە ئەمەریکاو ئەوروپا بڵاودەبنەوە، لە ١٩٦١ بە هاوبەشـی لەگەڵ سـامۆیل بێکیت خەڵاتی فۆرمێنتۆر وەردەگرێت، بۆرخیس، جگە لە خەڵاتی قودس و خەڵاتی تر... وەکو ج.م کۆتزی وتـی: "لەهەر کەسـێکی تـر زیـاتر، زمـانی ڕۆمـانی پـاکژو پاراو دەکردەوە، ڕێخۆشکەر بوو بۆ پەروەردەکردنی نەوەیەکی پێگەیشـتوو لە ڕۆماننووسە ئیسپانییە ئەمریکییەکان".

چەندە؟بەڵگە چییە بۆ چارەسەرە ئەلتەرنەتیڤەکان؟ بۆ هەڵبژاردنە ئەخلاقییەکان، فەلسەفە پێویستی بە هۆکارەکان هەیە، هەمیشە بە دوای هۆکاردا وێڵە: ئایا ڕەوایە کچێکی گەنج پێویستی بەوە هەبێت لە ڕێگەی هاوکاریکردنی بە پیتاندنی دەستکردەوە، سک بکات؟ ئایا پێویستە هەموو هەوڵەکان بخرێنە گەڕ بۆ درێژکردنەوەی ژیانی نەخۆشێک لە ڕێگەی بەکارهێنانی تواناکانی چاودێریی وردەوە، یان ڕێگە بدرێت بمرێت، بە کەمترین بڕ لە ترس وئازاری دەروونیی؟

هەموو کەسێک پێشبینی ئەوە دەکات بیرکردنەوەی فەلسەفی بۆ ئەوەی ڕەواو لۆجیکیانە بێت کارێکی سەخت و قورسە، بەڵام ئەوەی وایکردووە فەلسەفە بەگشتی و ڕەوشت  بە شێوەیەکی تایبەتی زۆر کاریگەر بێت، بوونی ئەو هۆکارو لێدوان و بیرکردنەوانەیە، نەک پێویستی بە ئەقڵێکی بەهێز هەیە بەڵکو پێویستی بە خەیاڵ فراوانیش هەیە.  ڕەوشت ژمارەیەکی زۆر ئامرازی بیرکردنەوە بەکاردێنێت، بەڵام مەسەلەکە تەنها فێربوونی بەکارهێنانی ئامرازەکان نییە: هەمیشە توانای بازدانێک لە خەیاڵدا هەیە- لە دیدێکی جیاوازتر یان بەراوردکردنێک مایەی گرنگیدان بێت تەواوی پرسیارەکە ڕوونتر دەبێت، بیرکردنەوەشمان دەباتە قۆناغێکی پێشکەوتووترەوە.

من هەمیشە ژمارەیەکی زۆر لە کەرەستە جیاوازەکانم لە بەشی دووەمدا بەکارهێناوە: بۆ نموونە، لێدوانی لۆجیکی، لێدوانی هەڵە، پێناسەکان، لێدوانە خزاوەکان؛ لە بەشی دووەم و سێیەمدا؛ دۆخە بەراوردکراوەکان، کە ئەزمونە

فکرییەکــان دەگــرێتەوە، لە بەشـــی چوارەمـــدا چەمـــکە جیاوازەکـــانی هزروبیرکـــردنەوە، ئێســـتا بـــا هەنـــدێ لە ئامرازەکـــانی بیرکـــردنەوەی ئەخلاقـــی بە وردەکـــارییەکی زیاترەوە بخەینە بەر باس و لێکۆڵینەوە.

### ئامرازی یەکەم: لۆجیك

لێـدوانی ڕەوا، ئەو لێـدوانەیە پێویسـتە هەڵگـری تـۆنێکی لۆجیکی بێت. لێدوان کۆمەڵێک هۆکارە هاریکاری گەیشتن بە ئەنجامێـک دەکـات. لێـدوان لە گەیشـتن بە ئەنجامێـک یـان لۆجیکێـک کە زنجیـرەیەک وتەیە ( پێیـدەڵێن بنەماکـان) لە ڕووی لـۆجیکییەوە بەرەو ئەنجامێـک دەمانبـات. لێـدوانێکی ڕەوا، دەرەنجامێک بە دواوەیەتـی وەکـو بـابەتێکی لـۆجیکیی پێویســت بــۆ بنەمــاو ســەرەتاکان. گەیشــتن بە ئەنجــام لە لێـدوانێکی ڕاســتەقینەوە ڕەنــگە ڕەوا بێــت یــان ناڕەوابێــت. لەگەڵ نزیکبــوونەوەی بەشـــی دووەم، وتەیەکـــی لـــۆجیکی ڕەوام پێشـکەش کـرد لە شـێوەی پێـوەرێکی لـۆجیکی بەڵام پێموابوو دەرەنجامەکە هەڵەیە چونکە یەکێ لە سـەرەتا یـان بنەماکان هەڵە بووە.

پێـوەری لـۆجیکی ئەو هۆکـارەیە دەتوانرێـت گوزارشـتی لێبکرێت لە شێوەی دوو دەربڕین، ئەوانیش بنەماکان لەگەڵ دەرهاویشـتەی ئەنجامێـک وەکـو مەسـەلەیەکی لـۆجیکی لە بنچینەو سەرەتاکان. لێرەدا دوو جۆری سەرەکی لە پێوەری لۆجیکیی ڕاستمان هەیە.




شێوەی(١٣) ئامرازی یەکەمی لێدوانەکان لۆجیکە. بەڵام ئاگاداری لۆجیکی هەڵەبە.

**پێوەری لۆجیکی ڕاست- جۆری ١**

سەرەتای ١ (p1) : ئەگەر p ئینجا q ( ئەگەر وتەی p ڕاست بێت بە دوایدا وتەی q ڕاست بێت)

سەرەتای ٢ (P2) : بۆ نموونە P ( وتەی P ڕاستبێت )

سەرەنجام (C) : q (لەبەرئەوە وتەی q ڕاستە)

ناوی هونەریی ئەم جۆرە پێوەرە لۆجیکییە یاسای پابەندبوونە. نموونەیەک لەو شێوەیە:

P1 ئەگەر کۆرپەلەیەک، کەسێک بێت، کوشتنی ئەو کەسە هەڵەیە.

P2 کۆرپەلە کەسێکە

C کوشتنی کۆرپەلە هەڵەیە

**پێوەری لۆجیکی ڕەوا – جۆری ٢**

سـەرەتای ١ ئەگەر P ئینجا q ( ئەگەر وتەی p ڕاستبێ ئینجا وتەی q ڕاستبێ)

سـەرەتای٢ q نەبـێ ( ئەگەر ئەو وتەیەی ڕاسـت نەبێت q بێت؛ ئەوا q هەڵەیە)

سەرەنجام p نەبێ ( ئەوا وتەی p هەڵەیە)

ناوی هونەری بۆ ئەم جۆرە پێوەرە لۆجیکییە یاسای پەیوەستبوونە. نموونەی خوارەوە:

P1 ئەگەر کۆرپەلەیەک، کەسێک بێت کوشتنی هەڵە بێت

P2 کۆرپەلەکە هەڵە نەبێت بکوژرێت

C ئەوا کۆرپەلەکە کەسێک نییە

ڕەنگە لێرەدا بەدوای ئەو هۆکارەدا بگەڕێین بۆچی هەڵەیە کۆرپەلەیەک بکوژین، ئەگەر ئەو کۆرپەلەیە کەسێک نەبێت.کاتێک تۆ لێکدانەوە بۆ باسێک دەکەیت سەبارەت بە ڕەوشتی پزیشکی، دەتوانرێ هەوڵی ئەوە بدرێ لێدوانەکە بەشێوەیەک گەرم بکرێت تا بگاتە ئاستی بنەڕەتی خۆی، وەکو لە بەشی دووەمی باسەکەماندا لەو گفتوگۆیەی ناوم نا گەمەکردن بە کارتی نازییەت. ڕەنگە لەمەوە سەرەتاکان بە ڕوونی دەستنیشان بکەین و پشکنینیان بۆ بکەین، ئەمەش یارمەتیدەر دەبێت بۆ دۆزینەوەی هەر هەڵەیەک لە خودی گفتوگۆکەدا. ڕەوشتە پزیشکییەکان و فەلسەفەی پراکتیکی بەشێوەیەکی گشتی گرنگی بە دامەزراندنی گفتوگۆیەک دەدات سەبارەت بەو کارەی دەبێ ئەنجامی بدەین لەسەر بنەمای ئەو سەرەتایانەی کە پێویستە هەموومان پەسەندی بکەین.

**ئامرازی دووەم: شیکردنەوەی چەمکی فیکری**

یەکێ لە پێکهاتە گرنگەکانی بیرکردنەوەی ڕاست، شیکردنەوەی چەمکە فیکرییەکانە. چوار جۆر شیکردنەوەی فیکریمان هەیە: پێناسەکردن؛ ڕوونکردنەوەی چەمک؛ جیاوازی کردن (کەرتکردن) و ناسنامەی هاوشێوەیەتی لە نێوان دوو چەمکی جیاوازدا (پارچەکردن). ئەم پێکهاتانە ناتوانن بەردەوام جیاواز لە یەکتری دەرکەون.

بۆ نموونە لە بەشی ٢ دا ، هەندێ پێناسەم بەخشییە جۆرە جیاوازەکانی مەرگی بێئازار و بەڕەحمانە . ئەم پرۆسەی دەستنیشان کردنە بەشێکی دانەبڕاوە لە جیاوازییەکان؛ ئەمانە بە چالاکی لە یەکتری جیا نابنەوە. ڕوونکردنەوەی چەمکەکان ئەرکێکی قورسە، پێویستییەکە لە ئەرکەکانی ئەخلاقی پزیشکی. ئێمە بە زۆری لە زۆربەی دۆخەکاندا چەمکە بێ کێشەکان بەکاردێنین، بەڵام کاتێ لە چوارچێوەیەکی نوێدا جێبەجێی دەکەین، لێڵ و نادیار دەردەکەون. یەکێ لە چەمکە گرنگەکانی بواری پزیشکی ئەوەیە بەرژەوەندیی باڵای نەخۆش لە بەرچاو بگیرێت. لە هەردوو یاسای بەریتانی و ئەمەریکیدا پزیشک پابەند کراوە بەوەی لە بەرژەوەندیی باڵای نەخۆشدا ئەرکەکانی جێبەجێ بکات. ئەگەر نەخۆشێکی گەنج تووشی هەوکردنی ڕیخۆڵە کوێرە بووبوو، ئەوا ئاشکرایە باشترین خزمەت بۆ باشترین بەرژەوەندی نەخۆشەکە لەوەدایە ڕیخۆڵە کوێرەکەی لاببرێت. بەڵام لە دۆخی نەخۆشێکی ئەلزیهامەردا کە کە تووشی شێرپەنجەی ڕیخۆڵەش بووە، پلانی کارگێڕی، لە بەرژەوەندیی باڵای ئەو نەخۆشییە دوو سەرەیەدا بێت، ڕوون نییە چییە. بەشێک لە کێشەکە ئەوەیە ئەو فاکتەرانەی

بەرژەوەندی باڵای ئەم دۆخە دیاری دەکەن نازانین چین، وە کێ لەم دۆخەدا بڕیار بە دەستە. جا ئەگەر مەسەلەکە زۆر کێشەداریش بێت، کاتێک سەبارەت بە بەرژەوەندی باڵا یان خۆشگوزەرانیی منداڵێک دەدوێین کە لە داهاتوودا دێتە بوون، وەکو لە دوا بەشدا بینیمان.

**ئامرازی سێیەم: ڕێکخستن و بەراوردی دۆخەکان**

پرەنسیپی بنەڕەتیی ڕێکخستن ئەوەیە ئەگەر بۆت دەرکەوت پێویستە بڕیاری جیاواز بدەیت، یان بە کاری جیاواز هەستیت، لە دوو دۆخی هاوشێوەدا. ئەگەر توانیت ئاماژە بە جیاوازیی پەیوەندی مۆراڵیی نێوان هەردوو دۆخەکە بدەیت، ئەمە لێکدانەوەیە بۆ بڕیارە جیاوازەکان. ئەگینا تۆ بە ڕێکخەر ناناسرێیت.

لە بەشی دووەمدا بەراوردێکم کرد لە نێوان ئەوەی دوکتۆر کۆکس ئەنجامیدا بە لیدانی (دەرزی پۆتاسیۆم کلۆراید) و ئەوەی دوکتۆرەکانی تر بەشێوەیەکی یاسایی ئەنجامیاندا (دەرزی مۆرفین ) لە هەمان ئەو دۆخە هاوشێوانەی کە دوکتۆر کۆکس بەرەو ڕووی دەبووەوە. بۆیە پرسیارم کرد بۆچی پێویستە دوکتۆر کۆکس تاوانباربێت بەوەی تاوانی مەترسیداری ئەنجامداوە کە تاوانی (هەوڵدان) بۆ کوشتنە، لە کاتێکدا دوکتۆرەکانی تر بە دەرزی مۆرفین خەڵکیان کووشتووە کەچی تاوانبار نین؟ ئایا ئەمە نا ڕێخراوبوونی کەیسەکانە، یان پەیوەندی بە جیاوازییەکی ئەخلاقییەوە هەیە؟ جیاوازییەکە بە ڕوونی ئەوەیە دوکتۆر کۆکس دەرزی دا لە نەخۆشەکەی بۆ ئەوەی بمرێ، بەڵام دوکتۆرەکانی تر دەرزی مۆرفینیان لە

نەخۆشــەکانیان دەدا مەبەســتیان مردنــی نەخۆشــەکەیان نەبوو، هەرچەند پێشبینی ئەوەیـان دەکرد مۆرفین دەبێتە هــۆی مردنــی نەخۆشــەکانیان. ئەگەرچــی ئەو جیــاوازییەی نێوان بە (ئەنقەست و پێشبینی کردن) لە ڕووی ئەخلاقییەوە پەیوەنـدییەکی پتەویـان هەیە، بەڵام مەســەلەکە پێویسـتی بە شیکردنەوەی زیاتر هەیە.



وێنەی(١٤) ئەنیشتاین ئەزمونە فیکرییەکانی وەکو ئامرازێک بۆ تێگەیشتن لە زانستی گەردوون بەکارهێنا،
ئەزمونە فکرییەکان بە ئامرازی زیندووی ئەخلاقی دادەنرێن.

### ئەزمونە فیکرییەکان

ئەو ئەزمونـــانەی بـــۆ بەراوردی دۆخەکـــان، یـــان بـــۆ چاودێریی ڕێکخستنی شتەکان، دەخرێنە ئەزمونەوە، تیۆری یان پراکتیکی یان خەیاڵین. زۆرجار فەیلەسووفەکان دۆخە خەیاڵییەکـان لە تـاقیکردنەوەی گفتوگۆکانیـان و پشـکنینی چەمکە فکرییەکاندا بەکاردێنن. ئەم ئەزمونە فیکرییانە وەکو زۆرێک لە ئەزمونە زانستییەکان دیزاین کراون، بۆ پشکنینی ڕاســت و دروســتیی تیــۆرییەک. مــن بەردەوام ئەزمــونی فیکریی زۆرم لەم کتێبەدا باسکردووە. یەکێ لە بەکارهێنانە خەیاڵئامێزەکـــان، بیرکـــردنەوەیە لە ئەزمـــونی فیکـــری کە گفتوگۆکـان بەرەو پێشـەوە دەبات، یـان بەرهەڵسـتیی ڕێگە ڕۆتینییەکانی بیرکردنەوەمان دەکات.

### ئامرازی چوارەم: پرەنسیپەکانی بیرکردنەوە

ژمارەیەکی زۆر کتێب و وتار بۆ شیکردنەوەی ڕەوشتی پزیشکی تەرخـان کراون، سەبارەت بە هەر چوار ڕێساکەو بوارەکـانی جێبەجێکردنـی (بـڕوانە نـاو چوارچێوەکە). ڕەنـگە ئەم پرەنســـیپانە زۆر باشـــتر بـــن لەو ســـەرەتایەی لە ئەرگیـۆمێنتی لۆجیکیـدا چـاوی لێدەکرێت، وەکو پشـکنینێکی بەسـوود بـۆ کۆمەڵێـک دیـدو بۆچـوون تەماشـا دەکرێـت. لە بیرکردنەوە لەوەی ئایا دەکرێ لەلایەن دکتۆرێکەوە پێشێلی تایبەتمەنـدییەکانی نەخـۆش بکرێـت. لەوانەیە دیـاریکردنی مەسـەلە سـەرەکییەکان لە ڕێگەی پشـکنینی دۆخەکـانەوە لە هەڵوێســتێکەوە بــۆ هەڵوێســتێکی تــر جیـاواز بێـت، لەگەڵ ئەوەشـدا ئەمە جگە لە سـەرەتایەک هیچـی تـر نییە. لێرەدا زیاتر پێویستمان بە شـیکردنەوەی چەمکەکـانی بیرکـردنەوە

هەیە (بـــۆ نمـــوونە ئەوەی لەم دۆخەدا مەبەســـتمانە بەرژەوەندی باڵایە ) لەگەڵ بڕیاردان ئەگەر پێویست بکات.

فـۆرمێکی تـر لە فۆرمەکـانی بیرکـردنەوە چەمکـی "لە سەرەوە بۆ خوارەوە " و ئەرگیۆمێنتە، ئەم فۆرمە بەدەر لە چوار پرەنسیپەکەیە، بەڵکو لە تیۆرە گشتییە ئەخلاقییەکەوە نـزیکە وەکـو تیۆرێـک لە سـوودگەرایی (utilitarianism). گفتوگـۆکردن سـەبارەت بە تیـۆرە گشـتییە ئەخلاقییەکـان لە دەرەوەی بـــابەتی ئەم کتێـــبەدایە. لە کرۆکـــدا ئەم بیرکـردنەوەیەی "لە سـەرەوە بـۆ خـوارەوە"، دیـاریکردنی تیۆرێکی مۆراڵییە، باوەڕوایە بە شێوەیەکی گشتی ڕاست و ڕەوایە.

لێدوان سـەبارەت بە نـاوەڕۆکە مۆراڵییەکـان بە ڕای مـن جـووڵەی بەردەوامە لە نێـوان کـاردانەوە ڕەوشـتییەکان بـۆ دۆخە تایبەتەکـــان و تیـــۆرە ڕەوشـــتییەکان. ڕاوڵ ئەم پرۆسەیەی ناونا کاردانەوەی هاوسەنگی.

| چوار پرەنسیپەکەی ڕەوشتی پزیشکی |
| --- |
| **١-ڕێزگرتن لە سەربەخۆیی نەخۆش**<br>سـەربەخۆیی، توانـای بیرکـردنەوەو بڕیـاردان و کـارکردنە، بنەمای ئەم جۆرە بیرکردنەوەو بڕیاردانە ئازادی و پشتبەخۆبەستنە (Gillon 1986). پێویـستە پیشـەوەرە تەندروستییەکان ڕێز لە سـەربەخۆیی نەخـۆش بگـرن (تەنـانەت لەکەسـانی تـرو خێزانـی نەخۆشـەکەش) بـۆ هاوکـاری کردنـی نەخۆشـەکان بە هـاتنە سـەر ڕاوبۆچـوونی ئەوان ( بـۆ نمـوونە گرنگیـدان بە ڕێنماییەکانیـان) و ڕێزگرتن و شـوێنکەوتنی ئەو بڕیـارانە ( تەنـانەت ئەگەر پیشـەوەرە تەندروستییەکان سوور بزانن بڕیاری ئەو نەخۆشانە هەڵەیە). |

٢- چاکەکردن: پێشکەشکردنی باشترین خزمەت بۆ نەخۆش

ئەم پرەنسیپە جەخت لە بەها ئەخلاقییەکان دەکاتەوە لە ڕێگەی چاکە کردن بۆ ئەوانیدی، بە تایبەتی لە بواری پزیشکییەوە، چاکە کردن بەرامبەر نەخۆش. گرتنەبەری ئەم پرەنسیپە وا دەخوازێ باشترین خزمەت پێشکەش بە نەخۆش بکرێت. ئەمەش ئەو پرسیارە دەورووژێنێ، ئەو کەسە کێیە حوکم لەسەر باشترین خزمەت دەدات بۆ نەخۆشەکە. ئەم پرەنسیپە زۆر جار بەوە لێکدەدرێتەوە کە تەرکیز دەکاتە سەر ئەو هەڵسەنگاندنە بابەتییەی لە ڕێگەی پیشەوەرە تەندروستییەکانەوە لە بەرژەوەندیی بالای نەخۆشەکە ئەنجامیان داوە. ڕای نەخۆشەکە لەسەر بنەمای ڕێزگرتن لە سەربەخۆیی نەخۆشەکە وەردەگرین.

ئەم دوو پرەنسیپە پێچەوانەی بەرژەوەندیی نەخۆشەکە دەبن، کاتێ نەخۆشەکە بژاردەیەکی دەبێت، لەگەڵ بەرژەوەندییە بالاکانیدا ناکۆکە.

٣- ئازار نەدان: ڕێگری لە ئازاردان

ئەم پرەنسیپە دیوەکەی تری پرەنسیپی چاکەکردنە، دەقەکەی ئەوەیە پێویستە ئازاری نەخۆشەکان نەدەین. لە زۆربەی دۆخەکاندا ئەم پرەنسیپە، هیچ سوودێک ناگەیەنێت بە پرەنسیپی چاکەکردن. هۆکاری سەرەکی دەستگرتن بە پرەنسیپی ئازارنەدانەوە ئەوەیە بەشێوەیەکی گشتی باوەڕمان وایبێت، ئەرکە دیارو ئاشکراکەی ئێمە ئەوەیە ئازاری کەس نەدەین، لە کاتێکدا ئێمە قەرزاربارین بە ئەرکی چاکە کردن بۆ ژمارەیەکی دیاریکراو لە خەڵک.

٤- دادوەری

ئەم پرەنسیپە لە چوار توخم پێکهاتووە: دادوەری لە دابەشکردن؛ ڕێزگرتن لە یاسا؛ ماف؛ و سزای دادوەری.

لە گەڵ ڕێزگرتن لە دادوەری لە دابەشکردندا پێویستە:

یەکەم، ئەو نەخۆشانەی دۆخەکانیان هاوشێوەیە، پێویستە هەمان

**چاودێری تەندروستییان هەبێت. دووەم، لە دیاریکردنی ئاستی چاودێریی تەندروستی بۆ یەک گرووپی نەخۆش تا لێی سوودمەندبن، ئەوا پێویستە رەچاوی ئەوە بکەین هەمان ئەم سەرچاوەو مادانە لە نەخۆشەکانی تردا بەکار بێنین ( لە کات، پارە، چاودێری وردی قەرەوێڵەکان) بە یەکسانی.**

**تووخمی دووەمی دادوەری، رێزگرتن لە یاسا، ئەگەر کارێک ئەنجام درا دژی یاسا بێت یان نا، پەیوەندییەکی ئەخلاقی هەیە، لە دیدی زۆربەی خەڵکەوە هەندێ هەلومەرج هەیە لەڕووی ئەخلاقییەوە رەوایە پێشێلی یاسای بۆ بکرێ، چونکە ئەگەر یاسا لە رێگەی پرۆسەیەکی دیموکراسیی ماقووڵەوە دارێژرا، ئەوا خۆی هێزی ئەخلاقی تیا لە بەرچاوگیراوە.**

**پێکهاتەی سێیەم مافە، ماف مشتومرێکی زۆری لەسەر کراوە بیرۆکەی بنەڕەتی ماف ئەوەیە، ئەگەر مافێک لای کەسێک بوو پێویستە بە زیادەوە بیدرێتەوە، مافەکەی پارێزراو بێت، رێزی لێ بگیرێت، تەنانەت ئەگەر لە رووی کۆمەڵایەتییەوە دەست کورت بێت.**

**دوا پێکهاتەش دادوەری لە سزاداندا، تەرکیز دەکاتە سەر سزادانی گونجاو بۆ تاوانێک. لە دەقە پزیشکییەدا هەندێجار کاتێک یەکێک تاوانێک دەکات تووشی کێشەی ئەقڵی و دەروونی بووە، کەیسەکە دادەخەن.**

لە رێگەی ئەم پرۆسەیەوە هەردوو بواری تیۆری و هزری، سەبارەت بە هەڵوێستە تاکەکان ملکەچی پێداچوونەوەن. کاتێک تیۆرەکان لە گەڵ ئەقڵییەتی ئێمەدا ناگونجێن سەبارەت بە دۆخە تایبەتەکان، نە ئالگۆریزم نە بەرنامە کۆمپیوتەرییەکان ناتوانن پێمان بڵێن ئێمە دەتوانین چی بگۆڕین یان پێویستە چی بگۆڕین. پێویستە ئەم مەسەلەیە مەسەلەی بڕیاردان بێت لەسەر دۆخەکان.

## دۆزینەوەی هەڵەکانی بیرکردنەوە

ژیربێژان ئارەزووی نـاو لێـنان و ئاشکراکردنی گفتوگۆ هەڵەکـــان دەکەن هەرچـــۆن باڵندەناســـان ئـــارەزووی دۆزینــەوەی باڵنــدە دەکەن. لە بەشــی دوو دا باســی قســەی ڕەق و بەدگوییمان کرد. دۆزینەوەی هەڵەکان ڕاهێنانێکی بە سوودە لە ڕەوشــتە پزیشــکییەکاندا، چونکە لە ڕووی هێزی ڕەوانبێژییەوە یارمەتیـدەرە تـا مشـتومڕ وگفتوگۆکە جـوان ببینـین بەلام لە کۆتاییدا گفتوگۆیەکی شکسـت خـواردووە. لێـرەدا دوو بە هەڵەچـوونی خـۆم لەلایەن (Flew 1989) ئاشکرا و دەستنیشان کراوە.

## نەسکۆتلەندییە ڕەسەناکان ناجوولێن

یەکێک دەڵێ : " هیچ ئەسکۆتلەندییەک بە ئامێری تیژ لە ژنەکەی نـادات"، کـابرا بەم وتەیەی تووشــی گـاڵتەپێکردن بووەوە، "هەر بەڕاسـتی بەڕێز ئەنگوس مەکسـپۆران[10] وای وتـــووە!" . لە جیـاتی ئەوەی پاشـــگەزبێتەوە درۆکە ڕێــک بخاتەوە، کە ئەم ئیدیعایە لەسەر نیشتمانەکەمان دەکەوێ، بە ســوورببوونەوە وتــی: " ئەوەی ئەسـکۆتلەندی ڕەسـەن بێـت شتی واناکات."

ئەوەی دەردەکەوێ ئاشکراکردنی حەقیقەتێکە (وتەیەکی ئەزمـــوونییە) ڕێگـــری دروســـت دەکـــات لە بەردەم نمـــوونە دژەکـــان بە گونجانـــدنی مانـــای وشـــەکان بە شـــێوەیەک ڕوونکـــردنەکە لە ڕووی پێناســـەوە ڕاســـت بێـــت، بەلام لە ڕووی ناوەڕۆکی ئەزموونییەوە، هەڵشانەو تەواو خاڵی بێت.

---

10 Angus McSporran

## تاکتیکی دە سەتڵە کونەکە[11]

ئەمەیــان پێشکەشــکردنی زنجیــرەیەک لە ئەرگــوێمێنتی ناڕاستە، بەڵام ئەگەر هاوکات بەشێوەی کۆمەڵ پێکەوە گرێ بــدرێن دەبــنە ڕاســت: هەنــدێ شــت هەیە دەبــێ بە وردی جیاکاری تیا بکرێت. لە ڕووی کۆکردنەوەی بەڵگەوە، چونکە هەموو مادەو بڕگەیەک خۆی لە خۆیدا قورساییەکی تایبەت بە خۆی هەیە.

## سروشت و ڕۆڵی خودا

لە بەشی دووەمدا دوو گفتوگۆمان هەبوو بەڵێنم دانــێ بە وردی باسیان بکەم:

گفت و گۆ لە سروشتەوە، گفتوگۆ لە ڕۆڵی خودا.

---

11سەتڵی کون کون، وەسفێکە بۆ کاری تێکردن input و دەرپەڕاندن output، لە کۆمەڵەیەکی فرەسیستەمی کارو تەکنۆلۆجیادا بەکارهێنانی شتێکی باوە.. شوبهاندنی سەتڵێکی مادیی کوندار ئەوەیە: ڕەنگە سەتڵەکە لێوانلێو پڕ ئاو بکرێت، بەڵام ئەنجامەکەی بەگوێرەی قەبارەی کونەکان ئاو لەدەست دەدات. واتە ئەنجامەکە، بەهەدەر دانەکە دیاریی دەکات. چەندە بڕی کونەکان چارەسەر بکرێن ئەنجامەکان پۆزەتیڤ تر دەبن (وەرگێڕ)




**وێنەی(١٥) ئسکۆتلەندیی ڕەسەن هێرش نابات: هەڵەشەییەک لە گفتوگۆدا**

**گفتوگۆ لە سروشتەوە**

بە ڕاشـــکاوییەوە گفتوگــۆ کــردن لە سروشـــتەوە لەو وتەیەدا کــورت بــۆتەوە کە دەڵــێ: "ئەمە سروشــتی نیــیە" کەواتە ئەمە هەڵەیەکی ئەخلاقییە. ئەو مشـتوومڕانەی دژ بە هاوڕەگەزبــازی دەکرێــت، زۆرجــار لە دووتــوێی ئەخلاقــی پزیشکییەوە ناوی هاتووە و باسی کراوە، ڕەوشتی پزیشکی

نەک تەنهــا لە ڕێــگەی ســەرنجدان لە مەســەلەی کوشــتنی بەڕەحمانە، دەستوەردانی کردووە بەڵکو لە گفتوگۆی توانا تەکنۆلۆجییەکــانی بۆمــاوەزانی و تەکنۆلۆجیــای منــداڵی بلوورییشــەوە ســەرنجی خــۆی هەیە، لەبەرئەوە ئەمجــۆرە مشتوومڕو ئەرگویمێنتانە بەلای کەمەوە لە سێ ڕەهەندەوە کێشــە دەنێــنەوە. یەکەم، هێشــتا بە تەواوی ڕوون نیــیە مەبەستی چییە لەوەی کە دەڵێ هەندێ شت سروشتی نییە. ئەگەر ١٠٪ ی مرۆڤەکــان بەزۆری هــاوڕەگەز بــازبن، ڕەفتــاری هاوڕەگەزبــازی لە جــۆرە جیاوازەکــانی تــردا دەبینرێــت. مەبەســت چیــیە لەوەی کە دەوتــرێ ئەوە هاوڕەگەزبازە سروشتی نییە؟ دووەم، بە ئاشکرا دیار نییە بــۆچی شــوێنکەوتەی ئەو ڕاســتییەین کە هەنــدێ شــت سروشــتی نــین. بــۆچی لە ڕووی ئەخلاقیــیەوە هەڵەیە. ئەو هۆکــارانە کامــانەن کە پاڵپشــتی ئەم بۆچوونــانە دەکەن؟ سێیەم، ژمارەیەکی زۆر نموونەی پێچەوانە هەن بەتایبەتی لە پیشــەی پزیشــکیی خۆیــدا، بانگەشــەی ئەوە دەکەن هەر شتێک سروشتی نەبوو هەڵەیە. ژیانی منداڵێک کە تووشی هەوکردنی مێشک بووە ڕەنگە لە ڕێگەی بەکار هێنانی دژە تەنەکانەوە، لە ڕێگەی چاودێری وردەوە چاکبێتەوە. کەواتە بۆچی لە کاتی چارەسەر نەکردندا سروشتی ئەو منداڵە بەو نــاوەوە بێــت کە سروشــتی نیــیە. ڕەنــگە هەڵەبــێ ئەگەر هاوکــاری دوو هاوســەر بکرێــت، تــا لە ڕێــگەی پیتانــدنی دەســتکردەوە وەچە بــخەنەوە، بەڵام ئەگەر ئەم پرۆســەیە هەڵە بێــت، مانــای ئەوە نییە پیتانــدنی دەســتکرد IVF ناسروشتی بێت.

**گفتوگۆ سەبارەت بە ڕۆڵی خودا**

لێرەدا پێویستە ڕاشکاوانە باسی ڕۆڵی خودا بکرێت: ئەمەش لە ڕووی ئەخلاقییەوە هەڵەیە، چونکە ڕۆڵی خودای تیا باسکراوە. کێشەی گفتوگۆکە بەشێوازی ئایینی، بە چەند ڕێگەیەک هاوشێوەی کێشەی سروشتە. ئەو پێوەرانە چیین کە بتوانین بە کاری بێنین بۆ جیاکردنەوەی فرمانەکانی خودا، لەگەڵ ئەوەی ڕۆڵی خودا بۆ مەرامی خۆمان بەکاربێنین؟ کام لەمانەی خوارەوە خودا ڕۆڵی تێدا دەبینێ: منداڵی بلووری؛ کێشانەوەی هاوکارییەکانی ژیان؛ لێدانی دەرزیی دژەتەن ANTIBIOTIC و چاندنی گورچیلە؟ جارێ سەرەتا با بزانین کاَم لەوانە پێش ئەوەی ڕۆڵی خودا باس بکەین هەڵەیە یان کامیان ڕەوایە،. لێرەدا چەمکی خودا هیچ پەیوەندی نییە بە دەستنیشان کردنی ئەو شتانەوە کە ڕاستن تا ئەنجام بدرێن.

**هەڵخلیسکان لە گفتوگۆدا**

سەرەنجام دەمەوێ لەم بەشەدا سەبارەت بە شێوازەکانی بیرکردنەوە، بگەڕێمەوە سەر گفتوگۆی خزاو، زۆرجار ئەم دەستەواژانە لە ڕەوشتە پزیشکییەکاندا بەکار هاتووە. کرۆکی باسەکە ئەوەیە، کاتێ دۆخێکی تایبەت پەسەند دەکەیت و لای تۆ کارێکی ڕەوایە، بەڵام دواتر بە لاتەوە سەختە یان مەحاڵە لەوە زیاتر ئەو دۆخانە هەزم بکەیت کە دۆخەکان بە ئاقاری توندڕەویی زیاتردا دەبەن و زیادڕەوی تێدا دەکرێت. کەواتە هەر لە سەرەتاوە ئەگەر ئەو

دۆخانەی زیادڕەوی تێدا دەکرێت و تۆ بە ناڕەوای دەزانی، پەسەندی مەکە، تەنانەت ئەو دۆخە سەرەتاییانەش پەسەند مەکە کە کەمترین توندڕەوی تێدایە.

نموونەیەک لەسەر ئەم بابەتە کە لە بەشی ٢ دا بە کورتی ئاماژەم پێدا، سەبارەت بە کوشتنی بێ ئازارو بەرەحمانەیە وەکو چالاکییەکی خۆبەخشانە، بۆ نموونە یەکێک پشتیوانی لە کەیسەکەی دوکتۆر کۆکس دەکات لە کوشتنی بە ڕەحمانەداو بە پەسەندی دەزانێ و پێی ڕازییە، بەڵام چەواشە کارییەکە لە گفتوگۆکەدا لەوەدایە ئەم کەسە گۆڕانکاری لە هەڵوێستەکانی لەسەر بنەمای ئەوە نییە ئەم کوشتنە هەڵەیە یان تاوانە، بەڵکو لەسەر ئەو بنەمایەیە کە دەڵێت ڕەنگە لە داهاتوودا ئەمجۆرە کوشتنە بە هەڵە یان بە ئەنقەست ئەنجام بدرێت.

سەرەکیترین هۆکاری ڕاگۆڕین سەبارەت بە مەسەلەکە پێویستە بەربەستێک لە خوارەوەی سەرەو لێژییەکە دابنرێت بۆ ئەوەی کاتێ دەمانەوێ بگەڕێینەوە هەنگاوی یەکەم بە مسۆگەری بگەڕێینەوە بۆ سەرەوە، یان هیچ نەبێ بە یەکجاری بۆ هەڵدێرەکانی خوارەوە نەخزێین.

لێرەدا دووجۆر هەڵخزانمان لە گفتوگۆدا هەیە: جۆری لۆجیکی لەگەڵ جۆری پراکتیکی یان ئەزمونی.

**هەڵخزان[12] لە گفتوگۆی جۆری لۆجیکی لە چیرۆکە دژ بە یەکەکاندا**

**ئەم جۆرە گفتوگۆیە ڕەنگە لە سێ هەنگاودا ببینرێت:**

هەنگاوی ١: وەکو مەسەلەیەکی لۆجیکی، ئەگەر بۆت دەرکەوت مەسەلەکە ڕەوایە ئەوا پێشنیاری p پەسەند دەکەیت. ئینجا پێویستە پێشنیاری q پەسەند بکەیت کە پەیوەندیدارە بە پێشنیارەکەوە. بە هەمان شێوە پێشنیاری r پەسەند دەکەیت ئیتر بەوجۆرە بۆ ئەگەرەکانی s, t ئەگەرەکانی p, q, r , s, t زنجیرەیەک ئەگەری یەک لە دوای یەکن زۆر هاوشێوەی یەکترین.

هەنگاوی ٢: دیوێکی تری گفتوگۆکە ئەوەمان بۆ دەردەخات، هەندێ قۆناغ لەم زنجیرە پێشنیارانەدا هەڵەو ناپەسەندن. وەکو t.

هەنگاوی ٣: ئەم مەسەلەیە، لۆجیکی پراکتیکی بە فەرمی دەگرێتە خۆی (شێوازی تۆلینس) وەکو دەرەنجامی ئەوەی لە دوا پێشنیاردا هاتووە بۆ نموونە (پێشنیاری t ) ئەگەر هەڵە بوو ئەمە مانای وایە بەشێکە لەو زنجیرەیەی لە دوای p ییەوە هاتووە کەواتە پێشنیاری p یش هەڵەیە.

بە کورتی هەنگاوی ١ دانانی ئەو بنەمایەیە: ئەگەر *p* *هەبوو بەدوایدا* *t* دێت. هەنگاوی ٢ دانانی ئەو سەرەتایەیە:

---

12the slippery slope argument

-ئەرگویمێنتی مەترسیی خزان، لە لۆجیک و بیری ڕەخنەیی و لە وتاری سیاسی و کێشەکاندا، پێداگرییە لەسەر گفتوگۆیەک کە لایەک پێیوایە: بە ڕێژەیی هەر هەنگاوێکی بچووک دەبێتە هۆی زنجیرەیەک ڕووداو، کە سەرەنجام هەندێ کاریگەریی گرنگ و لاوەکیی هەیە. (وەرگێڕ)

*halat*یه . هەنگاوی ٣ : ئامـاژەیه بۆ ئەوەی له میانەی ئەم سەرەتایانەوە premises به شێوەیەکی لۆجیکی دەڵێ *p* یش *هەڵەیه*.

هەنگاوی یەکەم له مشتومڕەکەدا سەبارەت به هەڵخزان له گفتوگۆکەیه یان لادان له گفتوگۆکەیه. تـوخمه گرنگەکەی گفتوگـۆکه بـۆ دانـانی زنجیـرەیەک پێشـنیاره وەکـو ئەوەی تـوخمه نزیکەکـان له زنجیـرەکەدا ئەوەنـده له یەکەوه نـزیکن هیچ هۆکارێکی ماقووڵ نییه تـا بڵێین ئەگەر پێشـنیارێک هەڵه بوو ئەوی تر تەواوه یان به پێچەوانەوە.

ئەم فـــۆرمه لـــۆجیکییەی هەڵخـــزان له گفتوگـــۆکه پەیوەندییەکی زۆر نزیکی به پۆلێک پارادۆکسـەوە یه که پێی دەوتــرێ " پارادۆکســه کەڵەکەبووەکــان" بــۆ یەکەمجــار گریکەکـان ئەم گوزارشـتەیان دیـاریکردو ناسـاند ( لەلایەن eubulides ەوە- بڕوانه Priest 2000 ).

نـاوی 'sorites' له 'soros' ی گریکەوە هـاتووه به مانـای کـۆمەڵ. نمـوونەیەکی کـۆن سـەبارەت به پارادۆکسـی گفتوگۆ هەیه دەڵێ، تەنها دەنکه لمێک کۆمەڵ دروست ناکات، زیادکردنی دەنکێک بـۆ سـەر هەر شـتێک کۆمەڵێک دروسـت ناکات، له بەرئەوە تۆ ناتوانیت کۆمەڵێک لم دروست بکەیت.

ئەم جۆره پارادۆکسـانه دروسـت دەبـن چـونکه زۆرێک لەو چەمکـانەی که بەکـاری دێـنین تەمـومژێکی دیاریکراویـان تیـایه: ئەگەر چەمکێک بەسـەر شـتێکدا جێبەجـێ ببێـت، ئەوا ئەو جێبەجێکـردنه بەردەوام دەبێـت ئەگەر گـۆڕانکـارییەکی بچـووک لەو شـتەدا ڕووبـدات. بەڵام تێبینـی کردنـی ئەو منداڵانەی له کەنـار یـاری دەکەن ئەوەمـان پیشـان دەدات که

تۆپەڵە لمەکان هەر بەڕاستی بوونیان هەیەو فۆرمی لۆجیکی ئەرگیۆمێنتی خزاو ناڕاستە. ڕەنگە پێشنیاری t هەڵە بێت کاتێ پێشنیاری p ڕاستە. ئەگەری سێ کاردانەوە هەیە بۆ ئەرگوێمێنتی خزاو.



وێنەی(١٦) ڕەنگە سەرەو لێژییەکە بگوڕێت بە پلەی پەیژە.

١-بۆهەر گۆڕانکارییەکی بچووک جیاوازییەکی ئەخلاقیی بچووک ڕوودەدات، ڕەنگە هەستی پێنەکرێت (وەکو دەنکە لمەکە). واتە کاتێک هەستی پێدەکرێت کە دەنکە لمەکان دەبنە تۆپەڵ.

٢- بۆ کێشانی هێڵێک یان بەربەستێک بە درێژایی سلۆپەکە یان لێژاییەکە، کێشانی هێڵی وردی هەڕەمەکییە ، بەڵام کێشانی هێڵ هەڕەمەکی نییە، لە پێناوی دڵنیابوونەوە

له سیاسەتی ڕوون(له یاسای ڕوون)، زۆرجار شتێکی ڕەوایه هێڵی ورد بکێشی هەرچەنده چەمکه بنەڕەتییەکان و بەها ئەخلاقییەکان پله پلەیی و لەسەرخۆ دەگۆڕێن.

٣- کاردانەوەی سێیەم، هەمیشه شیاوو گونجاو نییه، دانانی بەربەستێکه له دۆخێکی نا هەڕەمەکیدا بەلاّم به هۆکارێکی سەرەتایی پاساوداره. له دۆخی کوشتنی به بەزەییانەدا لایەنگرەکەی بەو پاساوه درێژه به گفتوگۆکانی دەدات که جیاوازی له نێوان کوشتنی به ڕەحمانەی خۆبەخش و کوشتنی به ڕەحمانەی خۆنەویستدا هەیه. له دۆخی کوشتنی بەڕەحمانەی خۆویستدا به هیچ جۆرێک کوشتنی خۆنەویست پەسەند ناکرێ: پەیوەندییه لۆجیکییەکان هاوشێوەی پەیژەیەکن زیاتر لەوەی سەرەو لێژییەکی زۆر لووس و خزاو بن.

### فۆرمی ئەزمونی سەبارەت به هەڵەی لۆجیکی (SSA)[13]

فۆرمی ئەزمونی هەڵەی لۆجیکی، یان لۆجیکی خزان بەرەو هەڵدێر( لۆجیکی هەڵدێران، ئەگەری بێ بنەما، بیرکردنەوەی هەڵه، بیرکردنەوەی بێ بنەما)، فۆرمێکی ئەزمونی یان پراکتیکییه، لۆجیکی نییه. بەرهەڵستکارانی کوشتنی به ڕەحمانەی خۆبەخش مشتومڕی ئەوەیانه ئەگەر ڕێگەمان دا به پزیشکەکان به ئەنجامدانی ئەم کوشتنه خۆویستانه، ئەو کاته ڕێگه خۆش دەبێ بۆ کوشتنی خۆنەویستانەش، ڕەنگه ئەمجۆره ئاڵنگارییه به شێوەیەکی لۆجیکی پەسەند بکرێت، چونکه هیچ هۆکارێکی لۆجیکی نییه

13 *The empirical form of slippery slope argument (SSA)*

بـۆ ئەوەی لەیەکێکیـانەوە نەخـزێین بەرەو ئەوی دییـان، ئەم هەڵدێرانە بەشێوەیەکی پراکتیکی ڕوودەدەن، بۆیە پێویستە لەســـەرمان بەپێـــی پـــلان کوشـــتنی خۆویســـتانە نەبێـتە پرۆژەیەک تەنانەت ئەگەر کوشتنەکە لە ڕووی پرەنسیپەوە ڕەوایش بێت و بە هەڵە نەیەتە ئەژمار.

ئەم فـۆرمە ئەزمـونییەی ئەرگویمێنـت، پشتبەسـتووە بە دانـانی ئەو گریمانانـەی سـەبارەت بەو شـێوازەی جیهـان بە کردەوە تێیدایە. لە دواییدا مەسـەلەکە سەبارەت بە مەودای گرنگیی بەڵگەکان لەسەر ئەمجۆرە ئەگەرانە دەورووژێنرێت. ئەوەی لە ڕووی پـراکتیکەوە ڕوودەدات زۆرجـار پشـت بە وردەکـــاریی دارشـــتنی ئەو سیاســـەتە دەبەســـتێ یـــان ســـەپێنراوە، دەکـرێ لە ڕێـگەی دانـانی بەربەسـتەوە ڕێـگە بگیرێت لە هەڵخزان بەرەو هەڵدێر، یان لە ڕێگەی وردەکاری ئەو هەلومەرجـانەوە کە ئەنجامـدانەکە ڕەوایە یـان نـا. لەم بەشـەدا لە هەنـدێ مەســـەلەی تـایبەتی ئەخلاقـی پزیشـکیدا گەڕامەدواوە لە پێنـاوی بیرکـردنەوە لە هەنـدێ کەرەسـتەی بیرکـردنەوەدا. لە بەشـی داهـاتوودا دەگەڕێمەوە سـەر ئەو مەسـەلانەی کە پێمـوایە یاسـا بەرامـبەر ئەو کەسـانەی لە ڕووی ئەقڵییەوە نەخۆشـن, دادوەرانە نییە. هـاوارەکەم یاسـا ناجۆرو دژ بەیەکە.

# بەشی ٦
# دژبەیەکی سەبارەت بە شێتی

*٤٣ یەمین ڕۆژی نیسانی ساڵی ٢٠٠٠: ئێمە ئەمڕۆ یادی سەرکەوتنێکی مەزن دەکەینەوە، پادشای ئیسپانیا، ئەو پادشایەی دۆزرایەوە. من ئەو پادشایە بووم... ئێستا هەموو شتێ بۆ من ڕوون بۆتەوە، هەموو شتێک وەکو دەستەکانم بە ڕوونی دەبینم بەڵام پێشتر نازانم بۆچی هەموو شتێکم بە جۆرێک لە تەمومژ دەبینی، ڕەنگە هۆکاری هەموو ئەمە، ئەو بیرۆکە پڕوپووچە بێت کە پێمانوایە مێشکی مرۆڤ لە کەللەی سەریدایە. ئەمە مایەی پێکەنینە. بەهیچ جۆرێک وانییە: لەسەر دەریای قەزوینەوە با هەڵدەکاو لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێ.*

*(گۆگۆل، بیرەوەرییەکانی پیاوێکی شێت، ١٨٣٥)*

له ساڵی ١٨٥١ دکتۆر ساموێل کارتڕایت[14] له گۆڤاری نیوئۆرلیان[15] که گۆڤارێکی پزیشکییه، بابەتێکی بڵاوکردەوه، باسی ئەو نەخۆشییە دەکات که دەبێته هۆی هەڵاتنی کۆیلەکان که نەخۆشییەکی دەروونییە، ئەم نەخۆشییە تووشی کۆیله قووڵه ڕەشەکان دەبێت، نیشانەکە بەوشێوەیە دەردەکەوێت کۆیلەکە مەیلی هەڵاتنی هەیە لە خاوەنە سپی پێستەکەی.
(له ڕێزنیک ١٩٨٧ وه وەرگیراوه)

له ١٩٥٢ له چاپی یەکەمی ڕێبەری ئاماری دەستنیشانکردنی نەخۆشییە ئەقڵییەکان له ئەمەریکا، بڵاوکرایەوه. ئەمە سەرەکیترین پۆلێنکاری بوو سەبارەت به نەخۆشییە ئەقڵییەکان. هاوڕەگەزبازی له ڕیزبەندی ئەم نەخۆشییە ئەقڵییانەدا خرابووه بەر باسوخواس. بەڵام جێگیرکردنی وەکو دۆخی تایبەت له چاپی دووەمی ڕێبەرەکەدا له ١٩٦٨ جێگیرکرا.

---

14 (Samuel Cartwright)
ساموێل ئەدۆلف کارتڕایت (١٧٩٣-١٨٦٣) پزیشکه، له ویلایەتی ڤیرجینیا له وڵاته یەککگرتووەکانی ئەمەریکا له دایکبووه. پێش جەنگ له لویزاناو میسیسیپی پیشەی کاری پزیشکیکردووه، کارترایت دۆزەرەوەی نەخۆشیی دیراپێتۆمانیا Drapetomania یه، که نەخۆشییەکی ئەقڵییه، به هۆی میکرۆبێکەوه سەری هەڵدەدا که دەبووه هۆی هەڵاتنی کۆیلەکان، بەهۆی ئەم بەکتریایەوه کۆیلەکان ئارەزووی ئازادی لەکەلەیانی دەدا. کارتڕایت ڕاشکاوانه له بواری تیۆری میکرۆبسازیدا ڕەخنەی دەگرت.
15 New Orleans Medical and Surgical Journal.

له ١٩٧٣ مشتومڕی گەرم سەبارەت بە دۆخی پزیشکی هاوڕەگەزبازی، لە کۆمەڵەی پزیشکیی دەروونیی ئەمەریکی لە ئارادابوو، سەبارەت بە دۆخە پزیشکییەکەی هاوڕەگەزبازی و بە زۆرینەی دەنگ کۆکبوون لەسەر ئەوەی هاوڕەگەزبازی لە لیستی نەخۆشییە ئەقڵییەکان دەربێنن.سیستەمی پۆلێنکردنی نەخۆشییەکان کە لە زۆربەی وڵاتانی ئەوروپیدا بەکارهاتووە لەنێو ئەو وڵاتانە بەریتانیا، پۆلێنکردنێکی نێونەتەوەیی نەخۆشییەکانە. چاپی بەردەست شەهوەی سێکسی (fetishism) وەکو نەخۆشییەکی دەروونی چاولێدەکات. بەم شێوەیە وەسفی دەکات:

*هەندێ شتی 'نازیندوو' هەن وەکو هاندەرێک بۆ وروژانی سێکسی و تێربوونی سێکسی، دێنە ئەژمار، هەندێ شت هەن پیرۆزن، چونکە درێژکراوەی جەستەی مرۆڤن، بە وروژێنەری شەهوەی سێکسیی جەستەی مرۆڤ دادەنرێن، لەجۆری جلوبەرگ، پێڵاو یان پێڵاوی پاژنەبەرز. هەندێ لە نموونە باوەکانیتر بەوە دەناسرێنەوە بە دەستلێدان چێژی تایبەت وەردەگرن وەکو لاستیک، چەرم و پلاستیکی نەرم.*

دەتوانرێ شەهوەی سێکسی دەستنیشان بکرێ، ئەگەر کەسەکە تووشی پاڵنەرو خەیاڵە سێکسییە چڕو بەردەوامەکان بوو، ئەو شتانەی کە باسکران، کاریگەریی لەسەر هەبێت. ئەگەر شەش مانگ لەوە پێش ئارەزووی لەسەر ئەو شتانەبوو. وە ئەگەر شتەکان گرنگترین سەرچاوەی وروژانی سێکسی بوون. لێرەدا پرسیارێک

خـۆی قـووت دەکـاتەوە، ئایـا لە ٢٠ سـاڵی ڕابـردووەوە شەهوەی سێکسی بە تێکچوونی باری دەروونی دادەنرا؟

لەشەستەکانەوە بەها کۆمەڵایەتی و ئەخلاقییەکان بەناوی دەستنیشـان کردنـی تێکچـوونە ئەقڵییەکـانەوە دەکەونە بەر شـاڵاوی هێرشـی ڕەخنەگرانـی پزیشـکی دەروونـی، ئەگەر شتەکە تەندروست بێت یان تەندروست نەبێت، ڕەنگدانەوەی پابەندبوونە بەهـا ئەخلاقییەکەی ئێمەیە دەکرێ بەرهەڵستی بکرێـت. ڕەنـگە بـابەتی نەخۆشـییە دەروونییەکـان کێشـەی قـووڵ و ئـاڵۆزی لـێ بکەوێـتەوە، بەڵام مـن ئەم کێشـانە دەخەمە لایەکەوە. هەنـدێ لە دۆخەکـانی وەکـو شـیزۆفرینیا، دەبێتە هۆی ئازاری زۆرو مرۆڤ لە ژیـانی ڕاستەقینە دوور دەخاتەوە، بەڵام من بەشـێوەیەک لەم مەسـەلەیە دەڕوانـم کە بـــابەتێکە گرنگییەکـــی تـــایبەتی لە پســـپۆریی پزیشـــکی ڕەوانناسیدا هەیە. ئەوەی من دەمەوێ لەم بەشـەدا ئەزمـونی لێوەرگرم ئەو پێوەرە بەکارهـاتووە جیـاوازانەیە کە نەخـۆش پابەند دەکات بە چارەسەرو دابینکردنی قەرەوێڵە لە شـوێنی مـانەوەو خەوانـدنەوە، لەلایەن بەشـی دەروونـییەوە، بـۆ ئەو کەسانەی تووشی کێشەی دەروونی بوون. یان نەبـوون، مـن پێموایە ئەو کەسـانەی تووشـی نەخـۆشی دەروونـی بـوون، لە دوو سەرەوە تووشی ستەمکاری دەبنەوە.

لە زۆربەی وڵاتە ڕۆژئاواییەکـان یاسـای تـایبەت هەیە ڕێـــگە بەو نەخۆشـــانە دەدات لە نەخۆشـــخانە بمێـــنەوە، چارەسەربکرێن بەو شێوەیەی خۆیان دەیانەوێ. ئەم یاسـایە دوو مەســـەلەی گرنگـــی لە خۆگرتـــووە: کەی دەتـــوانرێ چارەسەر بەسەر ئەو نەخۆشە دەروونییـانە فەرز بکرێت، لە

بەرژەوەندی ئەواندابێت کاتێک ئەوان نایانەوێ چارەسەر وەرگرن. چۆن کۆمەڵگە لەو کەسانە بپارێزین کەمەترسین بۆسەرخەڵک لە لایەن دەروون نەخۆشانەوە؟ پێمـوایە هەوڵدان بۆ ئەنجامدانی ئەم دوو کارە جیاوازە لە ناو یەک کۆمەڵەی یاساییدا شتێکی هەڵەیە.



وێنەی(١٧) تا ئەم دواییانەش هاورەگەزبازی homosexualityوەکو نەخۆشییەکی دەروونی دادەنرا، شەهوەباز fetishism تا ئێستاش بەو شێوەیە چاوی لێدەکرێت.

### تاوان و دەروون نەخۆشەکان

یاسـای تـاوان و سـزادان ئەو یاسـایەیە بەشـێوەیەکی بنەڕەتـی پەیوەنـدی بە پاراسـتنی خەڵـکەوە هەیە. لە گەڵ ئەوەشدا زەحمەتە ئەو کەسانەی کە دەروون نەخۆشن ئەو کـاتەی لە ڕووی دەروونیـیەوە ڕەفتـاری مەترسـیدار و نایاسایی ئەنجام دەدەن. وەکو تاوانبار بناسرێن. لە یاسای بەریتـانی و وڵاتـانی تریشـدا، بـۆ ئەوەی سـەرکۆنەی ئەو

کەسـە بکرێـت کە تاوانکـارە، دەبـێ دوو خـاڵی بەرچـاو بسەلمێنرێت: یەکەم ئەو کەسەی کە پەیوەندی بە کارەکەوە هەیە دەبــێ لە دۆخێکــی ئەقڵیــی تەواودا بێــت، تــاکو بەرپرســیارێتی ئەو تــاوانە بخــاتە ئەســتۆی خــۆی لە ئەنجامــدانی ئەو تـاوانەدا.لایەنی یەکەم ناسـراوە بە لایەنـی (کاری تاوانکاری) *actus reus*، لایەنـی دووەم ناسـراوە بە (نیـازی تاوانکـاری) *mens rea*، وردبوونەوە لە مەبەسـتی تاوانکـاری، لە تـاوانێکەوە بـۆ ئەویـدی جیـاوازی هەیە. بـۆ نمـوونە، بـۆ ئەوەی کەسـی تاوانکـار بە ئەنجامـدانی تـاوانی کوشـتن تاوانبـار بێـت، پێویسـتە (مەبەسـتێکی دیـاریکراو )ی هەبێـت. واتە پێویســتە نیـازی کوشـتنی هەبووبێـت، (زیـان گەیانـدنێکی ترسـناک بە جەسـتەی ) قوربـانییەکە. بۆ ئەوەی بیسـەلمێنی تـاوانی کوشـتنەکە بە مەبەسـت نەبـووە، پێویسـتە تەنها ئەوە بسـەلمێنی کە کەسەکە تەواو کەمتەرخەم بووە.

لە پرەنسـیپی لیبرالیـی جێگیـردا، ئەو کەسـەی لە ڕووی دەروونییەوە ناتەواوە بە "تاوانکار دانانرێت" تەنـانەت ئەگەر کـارێکی تاوانکاریشـی ئەنجـام دابێـت، لەسـەر ئەو بنەمـایە پێویسـت ناکـات بەرپرســیارێتیی ڕەفتارەکـانی لە ئەســتۆ بگرێـت بەهـۆی نەخۆشـییەوە. بە گوزارشـتێکی سـادە: «بە جەســتەی ئەو کــارەی ئەنجامــداوە، بەڵام بە ئەقڵــی ئەو تاوانەی نەکردووە».

یەکــێ لە کەیســە گرنــگ و ســەرەکییەکان کەیســە بەریتــانییەکەی دانیــاڵ مــاک نــۆتینە، شەکســپیری خۆشویسـتووە، نـاوەکەی بەچەنـد ڕێگـایەک هـاتووە. مـاک نـۆتین چەنـد بـاوەڕێکی وەهمـی بەسـەریدا زاڵبـووە، وەکـو ئەوەی باوەڕی وابووە پارتی تۆری بەریتـانی لەپشـت پلانـی

کوشـتنی ئەوەوەیە، بـۆیە بڕیاریـدا سـەرکردەی پـارتەکە ڕۆبەرت پییـل بکووژێـت، لە ١٨٤٣ تەقەی کـردو سـکرتێرە تـایبەتەکەی پییـل، ئێـدوارد درومۆنـد بەرکەوت و پییـل بەرنەکەوت، بە هۆکاری ئەوەی شێتە، ئازاد کرا، لە تـاوانی کوشـتن بێتـاوان دەرچـوو و ناردیـان بـۆ نەخۆشـخانەی دەروونیـی (بێدلەم Bethlem) لە خـوارووی بەریتانیـا، بە بڕیـاردان لەسـەر بێتـاوانی مـاک نـۆتین بـووە هـۆی تووڕەبوونی ڕای گشتی، ئەنجوومەنی لۆردەکان، داوای لە دادگا کرد چەند یاسایەک دەربکات (ئێستا بە یاسای مـاک نۆتین ناسراوە) بۆ دیاریکردنی ئەوەی چی کاتێک پێویستە کەسێک بە (بێتـاوان ) لە قەڵەم بدرێ، لەسـەر ئەو بنەمـایەی گوایە شێتە.



**وێنەی(١٨) لە هەوڵێکدا بۆ تیرۆرکردنی سەرەکوەزیرانی بەریتانیا ڕۆبەرت پییل. لە ١٨٤٣ یاسایەک دارێژرا، تێیدا هاتووە ئەگەر کەسێک شێت بێت، بە تاوانبار دانانرێت، ئەگەر تاوانێک ئەنجام بدات.**

**پاراستنی کۆمەڵگە لە کەسە مەترسیدارەکان**

شتێکی ئاساییە هەر کەسێک تاوانێکی قورس بکات کە تەواو مەترسیدار بێت، هیچ کێشەیەکی دەروونی نەبێت دەخرێتە بەندیخانەوە. لێرەدا چەند هۆکارێک هەیە بۆ ناردنی ئەو کەسانە بۆ زیندان. یەکێ لەو هۆکارانە تۆڵەکردنەوەیە: ئەم کەسە شایانی سزادانە، هۆکارێکی تری پاراستنی کۆمەڵگەیە.

لێرەدا دوو پرەنسیپی لیبراڵی بنەڕەتی هەیە تێکەڵ بە یاسای تاوانەکان کراوە، بەشێکن لە یاسای ئەورووپی بۆ مافەکانی مرۆڤ ئەوانیش:

١-ئەو کەسەی (هێشتا) تاوانی نەکردووە، نابێ لە زیندان رابگیرێت، نابێت لەسەر ئەو بنەمایەی پێشبینی دەکرێت، تاوانێک ئەنجام بدات دەستبەسەر بکرێت.

٢-پێویستە ئەو کەسەی، ماوەی سزای زیندانیی تەواوکردووە بگەڕێتەوە ناو کۆمەڵگە، هەرچەندە هەندێ تاوان ڕەنگە زیندانی هەتاهەتایی بێت.

ئەم دوو خاڵە تەنها بەسەر ئەو کەسانەدا دەسەپێنرێت کە هیچ کێشەیەکی دەروونییان نییە. ئەگەر تۆ کارێکی توندوتیژیت ئەنجامدا بەهۆی نەخۆشییەکی دەروونییەوە، دەتوانیت لە نەخۆشخانەیەکی دەروونی گل بدرێیتەوە، نەک لە زیندان. تا ئەوکاتەی باوەڕ وابێت کە تۆ مەترسیی تەواوت هەیە بۆسەر خەڵکانیتر. ڕەنگە ئەمە زیاتر درێژە بکێشێ لەو کەسەی ئەقڵی تەواوەو تاوانێکی هاوشێوەی ئەنجامداوە، لە ڕاستیدا ڕەنگە تۆ زیاتر بمێنیتەوە تەنانەت ئەگەر هێشتا کارێکی توندوتیژیت ئەنجام نەدابێت. من

زاراوەی (گلـــدانەوەی پارێزگـــاری) بەکـــاردێنم، وەکـــو ئاماژەیەک بۆ دانانی کەسێک لە ژینگەیەکی ئارامدا (زیندان یـان نەخۆشـخانەیەکی دەروونیـی ئـارام)، لەسـەر بنەمـای پارێزگـاری لەوانیـدی، یـان لە هەدووکیـان، لەم دۆخـانەی خوارەوەدا: کاتێ یەکێک (هێشتا) هیچ کارێکی توونـدوتیژی ئەنجـام نەداوە؛ لەگەڵ ئەوکەسـەی کارەکەی ئەنجامداوەو لە ژینگەی ئارامدابووە، بەهۆی سزای زیندانی کردنەوە. ئێستا دەتـوانین هەردوو پرەنسـیپە لیبـراڵییەکەی سـەرەوە بەم شێوەیەی خوارەوە داڕێژینەوە: "نابێت کەسێک بە مەبەستی خۆپـارێزی لێـی لە زینـدان ڕابگیـرێ". ئەوەی نیگەرانـی کردووم ئەوەیە ئەم یاسایە بەسـەر ئەو کەسـانەدا دەسـەپێ کە کێشـەی دەروونییـان نیـیە. ئەو کەسـانە نـاگرێتەوە کە کێشەی دەروونییان هەیە. ئەمەش دادوەرانە نییە.

بێگومـان لێـرەدا مەسـەلەیەکی گرنـگ لە سیاسـەتی گشتییدا هەیە، پەیوەندی بە خۆپارێزی کۆمەڵگەوە هەیە لەو کەسـانەی مەترسـی گەورە دروسـت دەکەن لە ڕێـگەی ئازاردانی خەڵکانی ترەوە. ئەم کێشەیە بەشێوەیەکی بەرچاو لە بەریتانیـا بـوونی هەیە، بەتـایبەتی هەڕەشـەکردن بۆسـەر منـداڵان. ئەو ئەرگیـومێنتەی مـن دەمەوێ بـیخەمە بەربـاس ئەرگیـومێنتێکە سـەبارەت بە ڕێکخسـتن و گونجانـدن. ئەگەر دوو کەسمان هەبوو، A لەڕووی ئەقڵییەوە تەواو نییە، B لە ڕووی ئەقڵـیـیەوە تەواوە، بەهەمـان شـێوە مەترسـین لە ئازاردانی خەڵکی تردا، ئەگەر ئەوە ڕاست بێت A بەنـاوی خۆپارێزییەوە لە زیندان ڕابگیرێت (گوایە مەترسییە بۆسـەر کەسانیتر)، ئەوا حەقە بەرامبەر B یش هەمـان شت ئەنجام

بدرێت. بە پێچەوانەشەوە ئەگەر بۆ B ڕەوا نەبێت لە زیندان بمێنێتەوە (وەکو لە یاسا ئەورووپییەکاندا هاتووە) ئەوا هەڵەیە ئەگەر A بەند بکرێت یان گل بدرێتەوە. ئەگینا جیاکارییەکی تەواومان کردووە دژی نەخۆشە دەروونییەکە. ئایا ئەم بیانووە بەهەر هۆکارێک بێت، جیاکارییەکی ئاشکرا نییە؟



وێنەی(١٩) ئەو تاوانبارەی کە ماوەی حوکمەکەی تەواوبووە، پێویستە لە بەندیخانە ئازاد بکرێت، تەنانەت ئەگەر هێشتا مەترسی بێت بۆسەر خەڵک، بەڵام دەروون نەخۆشەکان کە مەترسین بۆسەر خەڵک پێویستە بۆ هەتاهەتا گلبدرێنەوە. ئەمە دادوەرییە؟

ڕەنگە بتوانم ئەم جۆرە حوکمە بۆ چوار هۆکار بگێڕمەوە، بەڵام هیچ یەک لەم هۆکارانە بەڕای من ناتوانێ پاساو بۆ ئەو حیجزکردنە خۆپارێزییە (preventive detention)ە بهێنێتەوە. ئەو چوار هۆکارەش ئەمانەن:

١-کەسێک نەخۆشی ئەقڵی هەبێت مەترسیدارترە.

٢-هەڵسەنگاندنی مەترسیی زیانگەیاندن زیاتر جەخت لەو کەسانە دەکاتەوە کە لە ڕووی ئەقڵییەوە نەخۆشن.

٣- مەسەلەکە بەو شێوەیەیە ئەگەر ماوەی گلدانەوە، یان حیجزکردنی نەخۆشی ئەقڵی لە نەخۆشخانەی دەروونی بۆ ماوەیەکی درێژ، دەبێتە هۆی چاکبوونەوەی نەخۆشەکە و زیانگەیاندنی کەمتر بە خەڵکانیتر. گەمژانەیە ئەگەر نەخۆشەکە لەدەرەوە بێت و لە نەخۆشخانەی دەروونی چارەسەر وەرنەگرێت، لە پێناوی کەمکردنەوەی مەترسییەکان.

٤- دوا هۆکار پشت بەو جیاوازییە دەبەستێ کە لەنێوان داواکاریی نەخۆشێکی ئەقڵیدا هەیە لەگەڵ داواکاری ئەو نەخۆشەی لەڕووی دەروونییەوە چارەسەرکراوە. هەمیشە ئەو نەخۆشانەی گل دەدرێنەوە لەو نەخۆشانەن، نەخۆشییەکەیان درێژخایەنە، چونکە ئەمانە هێشتا مەترسی زیانگەیاندن بە خەڵکانی دەوروبەریان لێ چاوەڕوان دەکرێت. بۆیە ماوەی حیجزەکەیان بەردەوامە. ڕەنگە بەلای کەمەوە، لە ڕووی تیۆرییەوە جیاوازی بکرێت لەنێوان داواکاری ئەو کەسانەی نەخۆشن لەگەڵ داواکاریی ئەوانەی باشترن- تەنانەت ئەگەر هێشتا نەخۆشییان تێداماوە.

دەوترێ ویستە ڕاستەقینەکانی ئەو کەسەی نەخۆشە، ئەو ویستانەیە کە لە دۆخی باشیدا ئارەزوویان دەکات، خۆشی لە دۆخی باشیدایە. لەبەرئەوەی مەترسییەکەی بۆسەر خەڵک لە ئەنجامی نەخۆشیی ئەقڵییەوە بووە، پێشبینی دەکرێ ئەگەر بەرەو باشی بڕوات ئەوا ئەوشتە دەڵێ کە خۆی حەزی لێدەکات، بەلام کاتێ نەخۆشەو

مەترسی هەیە بۆ سەر ژیانی خەڵکیتر، پێویستە بە مەبەستی خۆپاراستن بەند بکرێت.

لەبەرئەوە ڕێزدانان بۆ سەربەخۆیی و ئارەزووە ڕاستەقینەکانی کەسێک کە لە باری ئاساییدایە، بەو مانایەیە ئەو کاتەی نەخۆش و (ترسناکە) بۆسەر خەڵکانی تر، بەند دەکرێت، نەک لە دۆخی ئاساییدا.

من ڕەچاوی هەر چوار هۆکارەکە هەر یەکە بە ڕۆڵی خۆیان دەکەم. هۆکاری یەکەم پەیوەندیدار نییە، ئەو دۆخەی بیری لێدەکەمەوە ئەو شوێنەیە دوو کەسی تیایە، ئەو کەسەی نەخۆشی دەروونی هەیە لەگەڵ ئەو کەسەی ساخڵەمە- هەمان مەترسییان بۆسەر خەڵکی هەیە.

هۆکاری دووەم بنەمایەکی لاوازی هەیە بۆ ڕێگەیەکی جیاوازتر ئەگەر ڕاست بێت؛ بەڵام بەوجۆرە نییە. سەختە بتوانین هەڵسەنگاندنێک بکەین بۆ ڕادەی مەترسییەکان بۆ سەر ژیانی خەڵک و ئازاردانیان، ئیتر چی لەلایەن مرۆڤی ئاساییەوە بێت یان نەخۆشە ئەقڵییەکانەوە. بەهەر حاڵ دەبێ ئەوە بزانین ئایا مەترسیی زیانەکان ئەوە دێنێ لەپێناو پاراستنی ژیانی خەڵکدا ئەو کەسە بەند بکرێت. ئاستی گومانەکان سەبارەت بە هەڵسەنگاندنی مەترسییەکان دەبێتە هۆی گۆڕینی هەڵوێستەکان بەرامبەر نەخۆشەکان، چاوخشانەوە بە کەیسەکەدا نەک پرەنسیپی حیجزی خۆپارێزی.

هۆکاری سێیەم چارەسەری تووشبووان بە نەخۆشی دەروونی، بەشێوەیەکی جیاواز لە کەسی ئاسایی مەترسیدار. بڕیارێکی نارەوایە، لە هەردوو بارەکەدا کەسی

حیجزکراو بۆ جاری دووەم ڕەنگە کەمتر مەترسی هەبێ بۆسەر ئەوانیدی. ئەگەر بەردەوام کەمکردنەوەی مەترسییەکان لە ڕێگەی گلدانەوەو حیجزکردنی ئەوانە بێت کە تووشی نەخۆشی دەروونی بوون، ئەوا بەهەمان شێوە ڕەوایە ئەوانەی ساخلەمن حیجزبکرێن. بەلام لەگەل ئەوەشدا من لەوباوەڕەدا نیم بۆ هەردوو کەیسەکە هۆکارێکی بەسوود بێت. ئەگەر بڕیار وابێت حیجزی خۆپارێزی هەبێت دەبێت لەسەر بنەمای زیانگەیاندن بێت لەسەر ژیانی کەسانیتر. ئەگەر دوو کەسی وەکو یەک جێگەی مەترسی بن، کەسی ئاقڵی مەترسیدار و کەسی نەخۆش، پێویستە هەردووکیان وەکو یەک ڕەفتاریان لەگەڵدا بکرێت.

هۆکاری چوارەم باشترین ئەرگویمێنتی هەیە، بەلام تەنانەت ئەمەشیان قایلکەر نییە. ئەو کەسانەی نەخۆشی ئەقڵییان هەیەو ئێمە لەسەریان دەدوێین ئەوکەسانەن نەخۆشی ئەقڵییان هەیە یان کەسایەتییان شێواوە. مەرج نییە ئەو ڕێگەیە ڕاست بێت "ئارەزووە ڕاستەقینەکانی" ئەو کەسانە بەند بکرێن. نەبوونی ڕێگەیەکی وەها لە گلدانەوەی کەسەکە بە بەندکراوی ڕەنگە گوماناوی بێت لەسەر بنەمای ڕێزگرتن لە کەسێتییە سەربەخۆیەکەی. گەیشتمە ئەو ئەنجامەی ئەگەر باوەڕمان وابوو کۆمەڵگە پێویستە ئەو کەسانە حیجزبکات کە مەترسین بۆسەر ژیانی خەڵکانی دی، پێویستە لەسەرمان هەمان ئەو شتانە بکەین بەرامبەر ئەوانەی لە ڕووی ئەقڵییەوە تەواون. پێچەوانەی ئەوە، ئەگەر باوەڕمان وابوو حیجزی خۆپارێزی پێشێل کردنێکی

ناڕەوای مافی مرۆڤە بەرامبەر ئەوانەی لە ڕووی ئەقڵییەوە تەواون ، ئەوا بە هەمان شێوە پێشێلێکی ناڕەوای مافی مرۆڤە بەرامبەر ئەو کەسانەی کە نەخۆشی ئەقڵییان هەیە. ئەو خاڵەی دەمەوێ ڕوونی بکەمەوە بە کراوەیی دەیهێڵمەوە چونکە دۆخی ئێستا بەو ڕێگەیەی لەسەری دەڕۆین ناتوانین پێداگری لەسەر بکەین چونکە ناڕەواو زاڵمانەیە.

## سەپاندنی چارەسەر بۆ ئەو کەسەی نەخۆشی ئەقلی هەیە

لەسەرەتای ئەم بەشەوە سەبارەت بە تێکچوونی ئەقڵی نووسیم تووشبووانی تێکچوونی ئەقڵی دووجار زوڵمیان لێدەکرێ، کە بەند دەکرێن، تەنها لە پێناوی پاراستنی ژیانی کەسانی دی نییە، بەڵکو لە پێناوی پاراستنی خۆشیانە. لە پرەنسیپە چەسپاوەکانی یاسا وئەخلاقی پزیشکیدا هاتووە ڕەنگە نەخۆشەکان ئەو چارەسەرانە ڕەتکەنەوە کە پزیشکەکان پێیانوایە بەسوودە بۆیان. نموونەیەکی کۆن لەسەرئەوە، لەلایەن جیهۆڤاوە گەواهیی ئەوە دراوە، ڕێگەنادات خوێنی پێ ببەخشن لەکاتێکدا ئەو ژنە خەریکە بمرێت ئەگەر خوێنی نەدرێتێ. بەپێی پرەنسیپە یاساییەکانیش کەسە گەورەو دیاریکراوەکان دەتوانن چارەسەرەکانیان ڕەتکەنەوە ئەگەر ئەو چارەسەرە بۆ ڕزگارکردنیشی بێت لە مردن. ئەم پرەنسیپە لە چارەسەری نەخۆشییە جەستەییەکاندا جێبەجێ دەکرێت. لەگەڵ ئەوەشدا لە زۆربەی وڵاتان ئەم پرەنسیپە بەسەر نەخۆشە ئەقڵییەکاندا جێبەجێ نابێت. بۆ نموونە ئەگەر بەریتانیا

وەربگــرین یاســای تەندروســتی دەرونــی چارەســەری زۆرەملێی بەسەر ئەو نەخۆشانەدا سەپاندووە کە لە ڕووی ئەقڵییەوە تەواونین.

بە پێی یاسای کاری تەندروستی دەرونیی بەریتانی سێ پێوەر هەیە، پێویستە لە حیجزی نەخۆش لە نەخۆشخانە بە مەبەستی چارەسەر ڕەچاوبکرێن:

١-پێویستە تووشی تێکچوونی ئەقڵی بووبێت.

٢-پلەی ناتەواوییەکەی بەو شێوەیە نەبێت چارەسەرە پزیشکییەکان ڕەتبکاتەوە.

٣-پەسەندکردنی چارەسەرەکە پێویستە " بۆ تەندروستی خۆی یان بۆ سەلامەتی گیانی ئەوانیتر". بەڕاستی بیرم لەوە کــردەوە ئەمە ســتەمکارییەکی بەردەوامە کــاتێ بیــر لە پاراســتنی کەســانیتر دەکەنەوە. ئێســتا دەمەوێ بیــر لە 'تەندروستی و سەلامەتی' نەخۆشەکە خۆی بکەمەوە.

ئەوەی جێی سەرنجە لە کاری تەندروستی ئەقڵیدا ئەوەیە کاتێ یەکێک ئەقڵی تێکچووە، ڕەنگە بەزۆر چارەسەر بکرێت بــێ گوێــدانە ویســتی وەرگــرتن یــان ڕەتکــردنەوەی چارەســەرەکە لە لایەن نەخۆشــەکەوە. لەوانەیە پێچەوانەی ویستی نەخۆشەکە چارەسەر دەست پێبکات ئەگەر (پزیشکی دەروونــی و پســپۆری کــۆمەڵایەتی) پێیــانوابوو، بــۆ ئەو چارەســەرە گونجــاوە. ئەمە دادوەری نیــیە ئەگەر کەســێکی نەخۆشی ئەقڵی توانای نەبێت بە حوکمی واقیع چارەسەرەکە ڕەت بکــاتەوە. مەســەلەکە ئەوەیە ئەگەر یەکێــک لەڕووی

ئەقڵییەوە ناتەواو بێت، ئەوا بڕیار دەکەوێتە لای پزیشکەکەو زۆربەی کێشـە دەروونییەکـان پەردەپۆش دەکرێن، ئەمەش گـرژی دروسـت دەکـات. هەنـدێ لە نەخۆشـەکان توانـای بڕیاردانیان نییە، هەندێکیان توانایان هەیە.

ساڵی ١٩٩٤ لە بەریتانیا کێشـەکە لە کەرتی تەندروستی ب.ڤ کرۆیـدۆن، خـرایە ژێـر چـاودێرییەوە. ئەم بـابەتە پەیوەندی بە ژنێکەوە هەبووتەمەنی ٢٤ ساڵ بوو، ناوی لە نەخۆشـخانەی نەخۆشـییە دەروونییەکـان تۆمـارکرا بە تێکچوونی سنووری کەسێتیی BPD . ئەو ژنە مێژوویەکی هەبـوو لە خـۆ ئـازاردان. بە زۆرەملـێ بە پێـی یاسـای تەندروسـتی ئەقڵـی گلـدرایەوە. بەردەوام خـۆی برینـدار دەکـردو ئـازاری خـۆی دەدا، لە نەخۆشـخانە ئەم ڕەفتـارە ناپەسـەندە زیانبەخشـەی لـێ قەدەغەکـرا، لە بەرئەوە وەکـو کـاردانەوەیەک دەسـتی کـرد بە مـانگرتن لە خـواردن، بەشێوەیەک کێشی بەشێوەیەکی بەرچاو دابەزی تا ئاستی مەترسـی. تـا مـانگی مایسـی ١٩٩٤ کێشـی بـووە ٣٢ کیلـۆ. دکتۆرەکەی ڕای وابوو ئەگەر بەو شێوەیە بەردەوام بێت لە مانگرتن لە خواردن، چەند مانگێکی کەم دەمرێت.

پزیشـکەکانی ویسـتیان لە ڕێـگەی "سـەرنج"ی گەورەوە خـواردنی بـدەنێ تـاکو ڕێگـری بـکەن لە مردنـی. ئەمەش لە ڕێگەی یاسـاییەوە بڕیـاری بـۆ دەرچـوو بـۆ ئەوەی نەمـرێ، تـاکو مەسـەلەکە دەچێـتە دانیشـتنی یاسـایی تەواوەوە. هەرچەندە کاتی دانیشتنەکە نزیکدەبووەوە بە زۆر خواردنی

دەدرایە، دادگای باڵا چاوی بەکەیسەکەدا خشاند بزانێت ئایا پێدانی خواردن بە سەرنج تەواو یاسابییە.

لە دادگای باڵادا ئەم خاڵانەی خوارەوە بڕیاری لەسەردرا:

(١)بۆیان دەرکەوت ژنەکە خۆی توانای ڕەتکردنەوەی چارەسەری هەیە. بەڵام (٢) کێشەی ئەقڵیی هەیە، لەبەرئەوە هەرچەند توانای ڕەتکردنەوەی چارەسەری هەیە، پێویستە بە زۆرەملێ چارەسەری بدرێتێ بەپێی یاسای تەندروستی دەروونی. چونکە باوەڕیان وابوو دۆخی ئەقڵیی شێواوە بەپێی سروشت و پلەبەندیی دۆخەکە کارێکی ڕەوایە بخرێتە نەخۆشخانەوە لەبەر باری سەلامەتی و تەندروستی نەخۆشەکە، پێویستە بە ناچاری چارەسەری بدرێتێ.

جارێکیتر بوونی ئەم پێوەرە جیاوازانە، کەلەو کەسانەدا بەکارهاتووە، کە نەخۆشی ئەقڵییان هەیە، بەبەراورد لەگەڵ ئەو کەسانەی کە نییانە، منی نیگەران کرد. ئایا سەپاندنی چارەسەر بۆ ڕزگارکردنی ژیانی یەکێ کە توانای ڕەتکردنەوەی هەیە، ڕەوایە، یان هەڵەیە. ئەوەی لەم کەیسەدا ناڕاستە گۆڕینی وەڵامەکەیە، کە پشتبەستووە بەوەی تووشی کێشەی ئەقڵی بووە. بێگومان زۆر کێشەی ئەقڵی بووەتە هۆی دەست وەردان لە توانای ڕەتکردنەوەی چارەسەر بە ڕێگەی زۆرەملێ. ڕەنگە دادگای باڵا بە هەڵەدا چووبێت بەرامبەر توانای ڕەتکردنەوەی چارەسەر لە لایەن (B)ییەوە. ڕەنگە ئێمە بە قووڵی پێویستمان بەوە بێت لەوە

تێبگەین کەی وە چۆن ئەقڵە ناتەواوەکان دەتوانن توانای ڕەتکردنەوەیان بەکاربێنن. ئەوەی بەلای منەوە پەسەند کراو نییە، چارەسەری نەخۆشە ئەقڵییەکانە بەشێوەی باوکسالاری، بەڵام ئەوانیتر کە نەخۆشی ئەقڵییان نییە ڕێگە پێدراون بە ئازادی چارەسەرەکان ڕەتبکەنەوە جارێکی تر ئەم جیاکارییە دژی ئەوانە بەکار دێنن کە تووشی نەخۆشی ئەقڵی یان دەروونی بوون.

# بەشی حەوتەم
# چۆن بۆماوەزانیی سەردەم
# نهێنییە بۆماوەییەکان ئاشکرا دەکات

ئای ئەو کارە چەندە مەزنە لەنێو دڵۆپێک تۆوەوە ئێمە سەردەردێنین، بە مۆری تایبەتمەندییەکانمانەوە نەک لە رووی جەستەییەوە، شێوەمان هاوشێوەی باوباپیرانمانە بەڵکو لە رێگەی بیرکردنەوەو لادانی ئەقڵیشیانەوە هاوبەشیانین. ئەو وزەو تواناو فۆرمە بێسنوورانە چۆن توانیویانە لەنێو ئەو دڵۆپە شلەدا نیشتەجێ بن و پارێزگاری لە خۆیان بکەن؟... دەتوانیین ئەوە بخەینە بەرچاو من لە باوکمەوە ئامادەیی بەرد دروستکردنم تیایە، چونکە بابم بە کاریگەریی ترسناکی بەردێکی گەورە لە میزەڵدانیدا گیانی سپارد...وامن بیستوپێنج ساڵە لە دایکبووم و ... واتە پێشئەوەی ئەو نەخۆش بکەوێت... لەو هەموو کاتەدا چی

وای کردووه خەمێکی قورس دامان بگرێت، لە ترسی ئەم بەڵایە؟ کاتێک هێشتا دووربوو لە فەزای نەخۆشییەوە، چی وایکرد تایبەتمەندیی ئەو مادە بچووکە بۆ من بگوێزرێتەوە؟ چۆن بەو شێوەیە بە شاراوەیی مایەوە تا ئەو ڕادەیەی لە چل و پێنج ساڵیدا هەستم بە دروستبوونی کرد...؟

(مۆنتێن، سەبارەت بە لێکچوونی منداڵان بە باوکانیان)

پێنجەمین شانەی دەست، ئەو ئێسکە درێژەیە کەوتۆتە لێواری لەپی دەستەوە، لە نێوان مەچەک و کۆتایی پەنجە تووتە. ڕەنگە نزیک جومگەی ئەم ئێسکە، شکانێک ڕووبدات، دیارە ئەو شکانە یەک هۆکاری هەیە: ئەویش ئەوکاتەیە مشتەکۆڵەیەکی لە یەکێک، یان لە شتێک دەدات. بێگومان کەسەکان خۆیان دان بەو ڕاستییەدا نانێن بەڵکو جۆری شکانەکە خۆی حەقیقەتەکە ئاشکرا دەکات. بۆماوەزانیی نوێیش تا ڕادایەکی زۆر توانای دەرخستنی ڕابردووی هەیە پێشبینی داهاتووش دەکات. لەوەش زیاتر پێی لێ ڕادەکێشێ، تاقیکردنەوەی بۆماوەزانی بۆ کەسێک توانای ئەوەی هەیە زانیاریمان سەبارەت بە کەسێکی نزیک پێبدات. پێش زانستی بۆماوەیی نوێ ئەم شتە تا ڕادەیەکی زۆر شاراوەبوو. بەڵام ئەم توانایانە لەگەڵ بۆماوەزانیی نوێدا سەرکەوتنی بەرچاویان بەدەست هێنا. ئەم پێشکەوتنانە ناچاریان کردین چاوێک بە نهێنییە پزیشکییەکاندا بخشێنینەوە.



وێنەی(٢٠) شکانی ئێسکە شانەی نزیک جومگەی پەنجەتووتە
چی نهێنییەک ئاشکرا دەکات؟

**کەیسی ١: پشکنینە جینییەکان نهێنییەکانی باوکایەتی ئاشکرا دەکەن**

با دەستبکەین بە ئاشکرا کردنی نهێنییەکان. لێرەدا دۆخێکی ڕاستەقینە، لەزانستی بۆماوەیی نوێدا هەیە، خزمەتی بە ڕاپۆرتەکەی *گۆڤاری* پزیشکیی *لانسێت* کردووە. جۆن و سارا سەردانی کلینیکی بۆماوەزانییان کرد بەمەبەستی چاودێریکردنیان کاتێک حاڵەتێکی سستی لە جیناتی بۆماوەیی کۆرپە تازە لە دایکبووەکەیانەوە بەدیارکەوت. تێکچوونێکی بەهێز لە باری دەروونی

هەردووکیانـدا سـەری هەڵـدا، لەبەر ئەوەی ئەگەری زۆرە منداڵەکە لە یەکەم ساڵی تەمەنیدا بمرێت.

ئەم شـێوانە جینییە ئەگەری هەیە بـۆ ئایندەی دووگیـان بوونەکە چارەسـەری پێشوەختی بـۆ بکرێت. جۆن و سـارە ئامادە بوون بۆ خۆیان و کۆرپەلە تووشـبووەکەیان سـامپڵی خـوێن وەربگیرێـت، بە مەبەسـتی پشـکنینی ترشـی نـاوکی DNA .




**شێوەی(٢١) کێشەی بۆماوەیی جەستەیی**

لەیەکەم دانیشـتنی پسـپۆری تـایبەت بە بۆمـاوەزانی، هەواڵیـان دایە دایکوبـاوکەکە، وتیـان بـۆ هەر منداڵێکیان لە ئاینـدەدا ٢٥٪ ئەگەری تووشـبوونیان بەم نەخۆشـییە هەیە (وێنەی ٢١). ئەم هەواڵە ڕاسـتە ئەگەر وامـان دانا کە جۆن بـاوکی بـایۆلۆجی یـان ڕاسـتەقینەی منـاڵە تـازە لە دایکبـووەکەی سـارایە. بەڵام پشـکنینە گەردییەکـانی سـامپڵی

ترشە ناوکییەکان ئەوەیان ئاشکرا کرد، بەهیچ شێوەیەک جۆن باوکی منداڵەکەی سارا نییە. لەمەوە ئەوەمان بۆ ئاشکرابوو، هەر منداڵێکی تر کە منداڵی بایۆلۆجیی جۆن و سارە بن زۆر دوورە لەوەی تووشی ئەو دۆخە سەخت و نەخوازراوە بێت. تەنها یەک کەس لە ۱۰۰۰ کەس جینی لە کارکەوتوو یان سست و خراپیان هەیە. بەدڵنیاییەوە جۆن، جینی سروشتی بەرهەم دێنێ، ئەمەش ناهێڵێ منداڵەکانی تری تووشی ئەم دۆخە نەخوازراوە بن.

لەم ئەزمونەوە پرسیارێک خۆی قووت دەکاتەوە. ئایا دەکرێت پسپۆرانی بۆماوەزانی ئەو ڕاستییە ئاشکرا بکەن کە جۆن باوکی ڕاستەقینەی منداڵەکەی سارە نییە؟

یەکێ لە ڕاپۆرتە گرنگە ئەمریکییەکان بەلایەوە پەسەندە پێویستە دۆخێکی لەم شێوەیە بۆ هەردوو هاوسەرەکە ئاشکرا بکرێت. ئەم ڕاپۆرتە بە تەنها خۆی پشتی بەستووە بە ڕاستگۆیی و پێبباشە ڕێی ڕاست وکراوە لەمجۆرە کەیسانەدا بگرینەبەر. لیژنە کاریگەرەکان لە هەڵسەنگاندنی مەترسیی جینە بۆماوەییەکان لە پەیمانگەی پزیشکیی ئەمەریکی فرمان دەکات، لەم جۆرە کەیسانەدا پێویستە تەنها ژنەکە ئاگادار بکرێتەوە: «نابێت پشکنینە جینییەکان بە شێوازێک ئەنجام بدرێن ببنە هۆی تێکچوونی شیرازەی خێزان». زۆربەی خوێندنەوەکان ئاماژە بەوە دەکەن زانایانی بۆماوەیی، لە ئەوروپاو لە ئەمەریکاش پشتگیری ئەمجۆرە ڕێبازە دەکەن. ساڵی ۱۹۹۰ مشتومڕێکی زۆر سەبارەت بە جیاوازی کولتورەکان کرا بۆ: «پاراستنی ڕاستگۆیی لە متمانەی دایک سەبارەت بە ئاشکراکردنی باوکایەتی ڕاستەقینە».



**وێنەی(٢٢) پێویستە ڕاوێژکارە پزیشکییەکە چی بە پیاوەکە بڵێت لە کاتێکدا پشکنینی ترشی دی ئێن ئەی، دەریدەخات ئەو باوکی منداڵەکە نییە؟**

زۆربەی زانایانی بواری بۆماوەزانی، ئامادەن ڕاستییەکان بشارنەوەو درۆ هەڵبەستن، بۆنموونە لە کەیسێکی وەکو کەیسی ئەم منداڵە نەخۆشەدا دەڵێن، ئەمە بازدانی جینیی بۆماوەییە، لەجیاتی ئەوەی ڕاستگۆبن لەگەڵ نەخۆشەکەیاندا و بڵێن، جۆن باوکی بایۆلۆجیی منداڵەکە نییە. بەپێی ئەو بەدواداچوونەی بۆ نەخۆشەکان کراوە، پێچەوانەی ئەوەی پزیشکەکان دەیڵێن، سێ بەشی بەشداربووان پێشنیاریان کردووە پێویستە پزیشک بە پیاوەکە ڕابگەیەنێ کە ئەو باوکی ڕاستەقینەی منداڵەکە نییە، بەلای کەمەوە ئەگەر ڕاستەوخۆ پرسیاری کرد. زۆربەی ئەوانەی لە ڕووپێوییەکەدا بەشداربوون لە ژنان بوون.

**نهێنیی پزیشکیی**

هیپۆکرات *Hippocrate* ، بە باوکی پیشەی پزیشکی ناسراوە، ساڵی ٤٦٠ پ.ز لە دوورگەی 'کۆس'ی یۆنانی هاتۆتە دونیاوە. سوێندی هیپۆکرات کۆنترین سوێندە لە یاسای پیشەیی بۆ ڕێنمایی پیشەکان بۆ پزیشکەکان دانراوە. ئێستا هەندێ لە ڕێنماییەکان کۆن بوونە. ڕەنگە هەندێ لە خوێندکارەکان ناچارنەبن یان بە لایانەوە گرنگ نەبێت بکەونە ژێرباری ئەوەی پەیوەستبن بە سوێندەکەی هیپۆکراتەوە:

*شانازی دەکەم بەو پیاوەوە، وەکو باوک و دایکی خۆم ئەم هونەرەی فێر کردم؛ بەردەوام لە گەڵیدا دەژیم و هەرچی لێم بوێت جێبەجێی دەکەم، وەکو خوشک و برا مامەڵە لەگەڵ منداڵەکانیدا دەکەم ، وە هەرکاتێ ویستیان، بەبێ مەرج و بێ بەرامبەر ئەم هونەرەیان فێردەکەم.*

بەڵام ئەوەی لە سوێندەکەدا سەبارەت بە نهێنییەکان هاتووە، زیاتر پەیوەندی بە بابەتەکەی ئێمەوە هەیە:

*هەموو ئەوەی لە ڕێگەی کارەکەمەوە، دەیزانم و فێری دەبم و دەیبینم، یان لە ژیانی تایبەتمدا کە نابێت ئاشکرایان بکەم، لە دڵی خۆمدا پارێزگارییان لێدەکەم و بە متمانەی تەواوەوە ڕەفتاریان لەگەڵ دەکەم...*

بۆئەوەی بە دواداچوون بۆ مەسەلەیەک بکەم کە زۆر نهێنییە، پێویستە مەسەلەکە زۆر بە وردی بەراورد بکەم: ئایا تایبەتمەندیی هاوبەش هەیە لەنێوان مەسەلەیەک و ئەو مەسەلەیەی ئێستا گفتوگۆی لەسەر دەکەم؟ ڕەنگە مەسەلەکە زۆر ڕوونتر بێت لەوەی کە پێویستە دوکتۆرێک ئەنجامی بدات.



وێنەی(٢٣) هیپۆکرات، لە ٤٦٠ پ.ز لە دایکبووە، "سوێندی هیپۆکرات" ناوەکەی بەخۆیەوەیەتی. ئەم سوێندە بە بنەمای نهێنییە پزیشکییەکان دادەنرێت، بەڵام لەسەردەمی زانستی بۆماوەیی نوێدا چۆن لێکدەدرێتەوە؟

**کەیسی ٢: باوکایەتی لە لایەن دایکەوە ئاشکرا کرا**

*... ماری شەش هەفتە دوای لە دایکبوونی منداڵەکەی سەردانی پزیشکی تایبەت بە دووگیانی و منداڵبوونی کرد، هاوسەرەکەشی، پیتەر لەهەمان شوێن ناوی تۆمارکرابوو. لەڕێگەی پزیشکی ڕاوێژکارەوە، ماری بۆی ئاشکرابوو پیتەر باوکی منداڵەکەی نییە.*

له کەیسێک وەکو کەیسەکەی ماری، زۆر بە فراوانی ڕەچاوی پاراستنی نهێنییەکانی ماری کراوە، پێویستە پزیشک و پیشەوەرانی تر ڕێنماییە پیشەییەکان بە هەند وەربگرن سەبارەت بەوەی کاتێ بڕیار لەسەر شتێک دەدەن پێویستە بزانن چی دەکەن. پێویستە هۆکاری زۆر تایبەت هەبێت وا لە دوکتۆرێک بکات تاکڕەوانە دژی ڕێنماییە پیشەییەکان کاربکات.ئەنجوومەنی پزیشکیی گشتی کە دەستەیەکی پیشەی پزیشکییە لە بەریتانیا، ڕێنماییەکانی بەم شێوەیەی لای خوارەوەیە:

*ئاشکراکردنی زانیارییە کەسییەکان بە بێ ڕەزامەندیی کەسی پەیوەندیدار، ڕەنگە ببێتە هۆی کێشەیەک کە نەخۆشەکە یان کەسانی تر بەرەو مەرگ یان زیانی گەورە ببات. کاتێ کۆمەڵەی سێیەم تووشی مەترسیی زۆر گەورە دەبنەوە بەجۆرێک زۆر قورستر بێت لەبەرژەوەندیی تایبەتی نەخۆشەکە ئەوا پێویستە داوای ڕەزامەندی بکەیت بۆ ئاشکراکردنی ئەو مەترسییە لە ڕێگەی پیشەی پزیشکییەوە. ئەگەر لەو ڕێگەیەوە نەبوو ئەوا پێویستە بەپەلە زانیارییەکان بۆ کەسێک یان لایەنێکی دیاریکراو ئاشکرا بکەیت. وە پێویستە پێش ئاشکرا کردنی زانیارییەکان بەشێوەیەکی گشتی ئەمە بە نەخۆشەکە ڕابگەیەنیت.*

له جێبەجێ کردنی ئەمجۆرە ڕێنماییانەدا سەبارەت بە دۆخێکی دیاریکراو، پێویستمان بەچەند لێکدانەوەیەکە. لەم دۆخەدا ئەم لێکدانەوەیە بەشێوەیەکی ڕێژەیی ڕاستەوخۆیە. ڕانەگەیاندنی مەسەلەکە بە پیتەر هیچ زیانێکی نییە بەبەراورد لە "مەترسی مردن یان ئازاری گەورە" لەبەرئەوە پزیشکەکان پێویست ناکات نهێنیی ماری ئاشکرا بکەن.

### بەراوردی کەیسی ١ لەگەڵ کەیسی ٢

ئەگەر دوکتۆرەکە نهێنیی ماری نەپارێزێ لە کەیسی ٢ دا ئایا دەکرێت جیهانی بۆماوەی سەردەم سەبارەت بە مەسەلەی باوکایەتی لە کەیسی یەکەمدا بێدەنگ بێت؟

لێرەدا جیاوازییەکی گرنگ لەنێوان هەردوو کەیسەکەدا هەیە، لە کەیسی یەکەمدا جۆن و سارە هەردووکیان قایل بوون بە دۆخەکە، سەبارەت بە حەقیقەتی ئاشکرابوونی نەبوونی-باوکایەتیی جۆن. بەڵام لە کەیسی دووەمدا مەسەلەکە تەنها لای ماری باسکراوەو لە پیتەر شاردراوەتەوە. لە کەیسی ١ دا جۆن و سارە هەردووکیان خۆیان هاتوون بۆلای پزیشکی بۆماوەزانی بۆ گفتوگۆکردن سەبارەت بە مەسەلەیەک کە گرنگیی هاوبەشی هەیە. زانیاریی پەیوەست بە باوکایەتییەوە، پەیوەندیی ڕاستەوخۆی بە مەسەلەیەکەوە هەیە جۆن و سارە لە پێناویدا هاتوون بۆ لای پزیشکی بۆماوەزانی.

لێرەدا ئەگەر زانیارییەکە تەنها بە سارە ڕابگەیەنرێت، ئاوا بێڕێزی بەرامبەر ئاشکرابوونی مەسەلەکە لای جۆن تا گرنگی بە مەسەلەکە بدات، دەکرێت.

### بنەماکانی نهێنیی پزیشکی

بەراوردی مەسەلەکە لەوانەیە بمانخاتە گومانەوە سەبارەت بەوەی پێویستە پزیشکی بۆماوەزانی لە دۆخی ١ دا چی بکات. لە ڕەچاوکردنی دۆخی ٢ دا چەند هۆکارێک هەیە پێماندەڵێ بۆچی پێویستە بۆماوەزانی پارێزگاری لە نهێنیی زانیارییەکان بکات لە جۆن. بەڵام لە کەیسی ٢ دا

چەند جیاوازییەکی لەگەڵ کەیسی ١ دا هەیە لە چەند لایەنێکی گرنگەوە لەبەرئەوە کەیسەکان تەواو جیاوازن.

ڕەنگە گەڕانەوەمان بۆ تیۆرییەکەو پرسیارکردن سەبارەت بە هۆکارە بنەڕەتییەکان کە وا دەکات پارێزگاری لە نهێنییەکان مەسەلەیەکی گرنگ بێت وەڵامەکەی ئەم سێ خاڵە زۆر باوەیە: ڕێزگرتن لەسەربەخۆیی نەخۆش؛ وەفاداری بەرامبەر ناوەڕۆکی پەیماننامەکە و بەدەستهێنانی باشترین دەرەنجام.

## ڕێزگرتن لە مافی تاکەکان

یەکێ لە بنەما گرنگەکانی ڕەوشتی پزیشکی ڕێزگرتن لە سەربەخۆیی نەخۆشە (بڕوانە چوار پرەنسیپەکەی ڕەوشتی پزیشکی). ئەم پرەنسیپە جەخت لە مافی نەخۆش دەکاتەوە لە بڕیاردان لەسەر ژیانی هەروەها تا ڕادەیەکی زۆر ئاماژە بەو کەسە دەکات کە بتوانێت دەستوەرداتە زانیارییە تایبەتییەکان بە خۆی - واتە دەستوەردان لە مافە تایبەتییەکانی. لەم بۆچوونەوە ئەو نەخۆشەی زانیارییە تایبەتەکانی خۆی بۆ دوکتۆرێک ئاشکرا دەکات، تەنها خۆی مافی ئەوەی هەیە بڕیاربدات، کێی تر بۆی هەیە ئەم زانیارییانە بزانێ، ئەگەر کەسێکی تر هەبوو. لەبەر ئەم هۆیەیە، پزیشک بۆی نییە ئەم زانیارییانە بۆ لایەنی سێیەم بە بێ مۆڵەتی نەخۆشەکە بگوازێتەوە.

## بەڵێنی شاراوە

هەندێ کەس مشتومڕی لەسەر ئەوەیە، پەیوەندیی نێوان پزیشک و نەخۆش بەڵێننامەیەکە نابێ ناوەڕۆکەکەی ئاشکرا

بکرێت. یەکێ لە خاڵەکانی ئەم بەڵێننامەیە ئەوەیە پزیشک بەڵێن بدات نهێنیی نەخۆشەکە بە پارێزراوی بهێڵێتەوە. چونکە کاتێ نەخۆشەکان کە دێن بۆ لای پزیشکەکان ئەو باوەڕەیان لا چەسپاوە، کە قسەدەکەن متمانەی تەواویان بەوە هەیە قسەکانیان بە نهێنی لای پزیشکەکەیان دەمێنێتەوە. لەبەر ئەو هۆکارەیە پزیشک ناتوانێ نهێنییەکان بدرکێنێ، ئەگەر پزیشکەکە ئەو نهێنییەی درکاند، ئەوا ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێ کە پزیشکەکە پەیمان شکێن بووە.

**باشترین دەرەنجامەکان**

یەکێ لە تیۆرەکانی فەلسەفەی ئەخلاقی، پێداگری لەسەر ئەوە دەکات کردەوەی ڕاست لە هەر دۆخێکدا ئەوەیە باشترین دەرەنجامی هەبێت. لەم ڕووەوە زۆر گرنگە پزیشکەکان نهێنی پارێزبن، چونکە بەم کارە بە ئاراستەی باشترین دەرەنجامدا دەڕۆن. تەنها ئەگەر دوکتۆرەکان بە تەواوی پارێزگاری لە نهێنییەکان بکەن، نەخۆشەکان زیاتر متمانەیان پێدەکەن. ئەم متمانەیە کارێکی زیندووە، ئەگەر نەخۆشەکان ویستیان داوای یارمەتی پێویست لە پزیشکەکان بکەن و متمانەی ئەوان بەدەست بێنن.

ئایا ئەم تیۆرییانە یارمەتیدەرن وەڵامی پرسیارەکە بدەینەوە: ئایا پێویستە پزیشکانی بۆماوەزانی بە جۆن ڕابگەیەنن کە ئەو باوکی کۆرپە تازە لەدایکبووەکە نییە؟

ڕێزگرتن لە سەربەخۆیی تیۆرییەکە ڕوون نییە، کاتێک دەمانەوێ لە کەیسەکەدا جێبەجێی بکەین. هەموو ئەمە پشت بەوە دەبەستێ تەرکیزمان لەسەر سەربەخۆیی چی کەسێکە. ئایا ڕێزگرتن لەسەربەخۆیی ئەوەیە مەسەلەکە لە جۆن بشارینەوە؛ بەوەی نهێنیی سارە پارێزراو بێت و جۆن

بەمەسەلەکە نەزانێ( تا ئەو کاتەی سارە خۆی ڕێگە بەوە بدات بە جۆنی ڕابگەیەنن).

تیۆری بەڵێنی شاراوەش بە هەمان شێوە بێ کێشە نییە. لە پراکتیکی کلینیکی ئاساییدا وەکو لە کەیسی ٢ دا ڕوون کراوەتەوە، ماری چاوەڕوانی ئەوەی لە پزیشکەکەی هەیە پارێزگاری لە تایبەتمەندییەکانی بکات. بەڵام لە کەیسی ١ دا زۆر ڕوون نییە تووخمە شاراوەکانی نێو "بەڵێننامەکە" چییە و چۆنە. ڕەنگە جۆن بە شێوەیەکی ماقووڵ چاوەڕوانی ئەوە بکات هەموو زانیارییەکان کە پەیوەندی بە بژاردەکانی منداڵبوونەوە هەیە بە کراوەیی لەنێوان خۆی و هاوسەرەکەیدا ڕوون و ئاشکرا بن.

بە دڵنیاییەوە ئەو هۆکارانەی بوونەتە هۆی ئەوەی ئەنجامەکە بەو شێوەیە بکەوێتەوە، پزیشکەکە نەتوانێت پێشێلی نهێنییەکان بکات، لەسەر ئەو بنەمایەیە شیرازەی خێزانەکە نەشێوێ. ئەمە ئەو هۆکارە سەرەکییەیە کە زانایانی بۆماوە نەتوانن ڕاستییەکان بە جۆن بڵێن کە ئەو باوکی بایۆلۆژیی منداڵەکەی سارە نییە. بەڵام هێشتا ئەوەش تەواو ڕوون نییە، ئایا مانەوەی جۆن بەو نەزانییە ئاکامەکەی باشترە یان خراپترە ئەگەر ڕاستییەکە بزانێت. ئایا ئەوە ڕاستە سارە پێویستی بە خۆپاریزی هەیە لە ئاکامی ئەو کردەوەیەی ئەنجامیداوە، ئایا بۆ خێزانەکە وا باشترە شتەکە بە نهێنی بمێنێتەوە؟ ئەمە نموونەیەکە لەو کێشە گەورەیەی کە پەیوەندی بە ئاکامگیرییەوە هەیە: ئەگەر پێتوابێ ئاکامگیری تیۆرێکی ئەخلاقیی ڕەوایە، ئەوا زۆرجار مەحاڵە بەڕادەیەکی باش بە دڵنیاییەوە ئاکامە جیاوازەکانی کارە جیاوازەکان دەستنیشان بکەیت.بە گەڕانەوە بۆ ئەو

تیۆره بنەڕەتییەی پشتگیری گرنگیی نهێنییەکان دەکات له ڕووی ئەخلاقییەوە، ئەو بەهایەی نییە جگە لە بەراوردکردنی دۆخەکان. هێشتا دڵنیانیین لەوەی ئایا پێویست دەکات پزیشکەکە بە جۆن ڕابگەیەنێ ئەو باوکی بایۆلۆژیی منداڵەکەی سارە نییە. لەو باوەڕەدام کێشەکە لەوەدایە ئێمە فۆکەسمان خستۆتە سەر لایەنی هەڵەی کێشەکە. پرسیاره سەرەکییەکە ئەوە نییە ئایا هۆکاری تەواو لەبەردەستە ئەوه بسەلمێنێ، بەرژەوەندیی جۆن نهێنییەکانی سارە پێشێل بکات، بەڵکو پرسیارەکە ئەوەیە کاتێک جۆن بەوە دەزانێت کە باوکیی بایۆلۆجی منداڵەکەی سارە نییە، ئایا هەمان بۆچوونی هەیە وەکو ئەوەی کە ئێستا هەیەتی. ئەم زانیارییانە بۆ کێیە؟ با ئەم پرسیارە لە کەیسێکی تردا و بە ئاوێنەیەکی ترتاقیبکەینەوە.

**کەیسی ۳: زانیاری بۆ کێ؟ نهێنی و دەستە خوشکەکانی**

*لە پشکنینی منداڵێکی چوار ساڵدا بۆیان دەرکەوت تووشی پووکانەوەی ماسوولکەی دوچینی DMD)[16] بووە، (نەخۆشییەکی قورسی گەشەکردووە ئەبێتە هۆی لاوازکردنی ماسوولکەکان، هەر لەتەمەنی هەرزەکارییەوە نەخۆشەکە دەخاتە سەر عەرەبانە، و لە بیستەکانی تەمەنیدا دەمرێ. پەیوەندی بە لەکارکەوتنی کرۆمۆسۆمی X ەوە هەیە بە تەنها تووشی کچان دەبێت.... بە لام کوڕان بەهۆی بازدانی بۆماوەییەوە تووشدەبن، هێلین دایکی ئەو کوڕەی*

16 *Duchenne muscle dystrophy (DMD)*

*که هەڵگری دۆخەکەیە، نیشانەکانی نەخۆشییەکەی تیانییە بەڵام نیوەی کورەکانی تووشی نەخۆشییەکە بوون.*

*هێلین خوشکێکی هەبوو بە ناوی پێنیلوپەوە، دووگیان بوو لە هەفتەی دەیەمدا، پزیشکی منداڵبوون پینیلوپی دایە دەست تیمێکی بۆماوەزانی دوای ئەوەی هەواڵیدا خوشکەزاکەی لە قسەکردن دواکەوتووەو گەشە ناکات. هەرچەندە نزیک نییە لە خوشکەکەیەوەو مەسەلەکەی لا باسنەکردووە، بەڵام دوودڵە لەکاریگەریی نەخۆشییەکە لەسەر دووگیانییەکەی. لە گفتوگۆکەی لە گەڵ زانایانی بۆماوەزانییدا لە کلینیکەکە (نەیانزانی لەم قۆناغەدا هەردوو خوشکەکە لە هەمان کلینیکدا بوون) پینیلۆپ بە پزیشکەکانی وت ئەگەر کۆرپەلەکەی هەڵگری ئەو نەخۆشییەیەو کاریگەریی دۆخێکی مەترسیدار لەسەریەتی ئەوا لە ناوی دەبات. دواکەوتنی قسەکردن و گەشەکردنی منداڵەکە لە سیفاتەکانی کۆمەڵێک هەلومەرجە مەرج نییە ئاماژەبێت بۆ پشکنینی DMD . جگە لەوەش لەبەرئەوەی جینی DMD گەورەیەو ئەگەری چەند بازدانێکی بۆماوەیی هەیە، بۆیە ڕاست نییە بەبێ بوونی زانیاری تەواو کە بەرپرسە لەو دۆخە, وەکو دۆخی خوشکەزاکەی پڕ زانیاری بێت.*

*لە دوا دیداریدا لەگەڵ پزیشکەکانی بۆماوەزانی لە کلینیکەکەدا، هێلین ئەوەی دەزانی خوشکەکەی دووگیانە و ئەوەشی دەزانی بۆی هەیە دووگیانییەکەی کاریگەری بۆماوەیی لەسەر بووبێ، بەڵام ئەم قسەیەی لای خوشکەکەی نەدرکاندووە، بەشێکی مەسەلەکە لەبەرئەوە بوو دەست وەرنەدەن لە شتێک پەیوەندی بەوانەوە نییە، بەڵام گومانی لەوە هەبوو خوشکەکەی دەرک بەمەسەلەکە دەکات و ئەگەر بۆی دەربکەوێ کۆرپەکەی تووشبووە ئەوا*

*کۆتـایی بە دووگیـانییەکەی دێنــێ. هێلـین هەسـتی دەکـرد بەوەی ئەمەش هەڵەیە بەڵام زۆر بەوردی بیـــــــــری لەم مەسـەلەیە کردۆتەوە و بڕیاری داوە ئەنجامی پشکنینەکانی ئەو زانیارییـانەی پەیوەنـدی بە کـوڕەکەیەوە هەیە بە نهێنـی بمێنێتەوە.*

*(پارکەر و لۆکاسین، گۆڤاری لانسێت، ٣٥٧ ، (٢٠٠١) )*

من دەمەوێ ئەوە بخەمە لاوە ئایا پێویستە یان پێویست نیـیە پینیلـۆپ ئەگەر هەڵگـری ئەو جیـنە بێـت کۆتـایی بە کـۆرپەلەکەی بێنــێ، پــارکەرو لۆکاســین پێشــنیاری دوو سـامپڵیان کـرد: نمـوونەی ئەژمــاری کەســی و نمـوونەی ئەژماری هاوبەش.

## نموونەی ئەژماری کەسی

## *The personal account model*

نمـوونەی ئەژمـاری کەسـی ڕاوبۆچـوونی ئاسـاییە بـۆ نهێنیـی پزیشـکی، بەپێـی ئەم ڕاوبۆچـوونە ئەو زانیارییـانەی پەیوەندییان بە دۆخی جینیی هێلینەوە هەیە- وەکو هەڵگری دۆچینی ماسوولکەی پووکاوە، دەگەڕێتەوە بۆ هێلین تەنها هێلـــین. ڕێزگـــرتن لەم نهێنیـــیە گـــرنگە. لەگەڵ ئەوەشــــدا مــاوەیەکی زۆرە ســنوورێک بۆئەمجــۆرە نهێنیـیە دانــراوە، وەکو لە ڕێنماییەکانی (GMC) دا لەسـەرەوە تەواو جەختـی لەسـەر کراوەتەوە[١٧]. بەڵام ئەم سنووردارکردنە هەڵاوێردەیە.

---

١٧ڕێنماییەکانی دەستەی پزیشکی گشتی -General medical council) (GMC ئەنجوومەنێکە کاری ڕێکخستنی پزیشکییە لە بەریتانیا، لەڕێگەی ژمـارەیەک پێـوەرەوە ئەرکـی ئەم ئەنجـوومەنە پاراسـتنی تەندروستی و

لەم ڕاوبۆچـــوونەوە پرســـیارە ســـەرەکییەکە ئەوەیە ئەو زیانەی بەر پینیلۆپ دەکەوێت ئەگەر زانیارییە ترسناکەکانی شـــاردبێتەوە، ئەوا ئەوەنـــدە بەســـە بـــۆ ئەوەی پێشـــێلی نهێنییەکانی هێلین بکات.

## نموونەی ئەژماری هاوبەش

لەم نمـــوونەیەدا زانیـــارییە بۆماوەییەکـــان وەکـــو ئەو زانیارییانەی سـەبارەت بە ژمـارەی بـانکیی هـاوبەش بوونی هەیە، لەلایەن چەنـد کەسـێکەوە هاوبەشـە. داوای هێلـین پەیوەنـدیی بە دیـاریکردنی نهێنیی گونجـاوەوە نییـە- بەڵکـو هاوشـێوەی داواکـاریی ئەو بەڕێـوەبەری بـانکەیە زانیـاری ســـەبارەت بە خـــاوەنی ئەژمارەکـــانی تـــر نەدرکێـــنن. لەم ڕوانگەیەوە پێویستە زانیـارییە جینییەکان بەڕێگەیەکی تەواو جیـاواز ببینـرێن لە زۆربەی زانیـارییە پزیشـکییەکان، ئەمـانە ئەو زانیارییـــانەن کە پێویســـتن بـــۆ تەواوی "خـــاوەن ئەژمارەکـان" – واتە هەمـوو تاکەکـانی خێـزان (نزیکەکـان) لەلایەنـی میـراتییەوە. بەڵام هەنـدێ هۆکـار هەیە ڕێگـرە لە زانینی تەواوی زانیارییەکان.

ئەم دوو نمـــوونەیە بەرپرســـن لە ســـەلماندنی ئەوەی پەیوەنـــدیی بە زانیـــارییە هاوبەشـــەکانەوە هەیە بەڕێـــگەی پـێچەوانە. لە ئەژمـــارە کەســـییە ئاســـاییەکەدا لە نمـــوونەکە دەپرســـین: ئایـــا ئەو زیانـــانەی بەر پینیلـــۆپ کەوتـــووە بەو ڕادەیە گەورەیە کە مافی هێلین لە پاراستنی نهێنیدا پووچەڵ

---

سـەلامەتیی جەمـاوەرە، لە کـاری پیشـەی پزیشـکیدا، بە یاسـای تـایبەت ئەم دەســتەیە دەســتکراوەن بــۆ جێبەجێکردنــی ئەو چــوار ئەرکەی کە پێشــتر باسکران بە پێی یاسای گشتیی پزیشکی لە ساڵی ١٩٨٣. (وەرگێڕ)

بکـــاتەوە؟ لە نمـــوونەی ئەژمـــاری هاوبەشـــدا زانیـــارییە جینییەکـــان هەرچەنـــدە لە ڕێـــگەی خـــوێن و مێـــژووی پزیشکییەوە لە هێلین بە دەستهێنراوە، کە 'دەگەڕێتەوە' بۆ خێزانەکە، پینیلۆپ بە هەمان شێوە هەمان مافی هەیە لە زانیارییەکاندا چونکە زانیاری بنەڕەتین بۆ یارمەتیدانی لەسەر زانینی لایەنە گرنگەکەی پێکهاتە جینییەکەی، پێویستە هۆکارێکی قایلکەر هەبێت تا هێلین بتوانێ پینیلۆپ بێبەش بکات تا دەستی نەگاتە جینە بۆماوەییەکان لە تێستی DMD دا.

هێلین نەک هەر زانیاری سەبارەت بە خۆی و کوڕەکەی هەیە بەڵکـــو دەربـــارەی پینیلـــۆپ و منـــداڵە لە دایـــک نەبووەکەشی زانیاری هەیە. هێلین ئەوە دەزانێ کۆرپەلەکەی پینیلـۆپ چانسـێکی گەورەی هەیە تووشـــی پووکـــانەوەی ماسـوولکەی DMD بێـت، بەڵام پینیلـۆپ ئەوە نـازانێ. ئەم نـــاڕێکییە لە زانیارییەکـــان بـــۆ پینیلـــۆپ دادوەرانە نیـــیە. شکستهێنانی نموونەی ئەژماری کەسی لە وەرگرتنی بەهای ئەم ڕاستییە، زانیارییە جینییەکانی تاک، کۆمەڵێک لە گریمانە ئەخلاقییەکـــان دەبەزێنـــێ، کە لە گفتوگۆکـــانی ئەخـــلاقە پزیشکییەکان لە هەر یەکە لە باکوری ئەوروپاو ئەمەریکای باکور دەخرێنە بەرباس. ڕەنگە ئەو دۆخانەی ئێمە بیری لێدەکەینەوە مەسەلەیەکی قووڵتر بوروژێنێ، سەبارەت بە نهێنییە پزیشکییەکان لە زۆر شوێنی تر. ئێمە لە ڕووی کـــۆمەڵایەتی و بـــایۆلۆجییەوە پـــێکەوە بەســـتراوین. هـــیچ کەسێک بە تەواوی لە دورگەیەکدا تەنها خۆی بوونی نییە. لە ڕاســـتیدا پەیوەنـــدیمان بە یەکتـــرییەوە تەنهـــا لە ڕووی بۆماوەییەوە پەلی نەهاویشتووە، بەڵکو بە تەواوی جیهاندا درێژبۆتەوە وەکو لە بەشی داهاتوودا دەیبینین.

# بەشی هەشتەم

# ئایا لێکۆڵینەوەی پزیشکی.. ئیمپریالیزمی نوێیە؟

*لە ڕۆژژمێرە درێژەکەی ساڵدا، ساتێک بۆ میهرەبانی، بەخشندەیی، خێرخوازی، بۆساتێکی خۆش .. تەنها جارێک ئەو کەسانەم ناسیوە بەوشێوەیەبن، تەنها جارێک دەبینم کاتێک ژنان و پیاوان یەکێکیان ڕەزامەندی دەردەبڕن ڕازین بەوەی دڵە قفڵ دراوەکانیان ئازادانە بکەنەوەو لە خۆیان بدوێن، تەنیا جارێک بینیم، بیر لەکەسانی خوار خۆیان بکەنەوە وەکو ئەوەی تا کەناری گۆڕ هاوڕێی یەک بووبن، نەک مەخلوقێک بن لە چینێکی تر و پەیوەست بن بە گەشتێکی تری ژیانەوە.*

*(چارلز دیکنز، سرووتی کریستمس)*

سـبەینێی پزیشـکی، تـوێژینەوەی ئەمـرۆیە. لەبەرئەم هـۆیەیە مەسـەلەی چـۆنێتی تەرخـان کردنـی سـەرچاوەی دارایـی بـۆ تێژینەوەکـان، گـرنگییەکەی کەمتـر نیـیە لە تەرخـانکردنی بـودجەی تـایبەت بـۆ چـاودێری تەندروسـتی خـۆی. بەڵام لە تەوەری گفتوگـۆ ئەخلاقییەکانـدا مەسـەلەکە ئەو بابەتـانە نیـیە، بەڵکـو سـتراتیژی زۆربەی گفتوگۆکـان لێکۆڵینەوەیە لە ئەخلاقە پزیشکییەکان، لە مەسەلەی چۆنێتی ڕێکخستنی توێژینەوەکاندا. لە ڕاستیدا توێژینەوەی پزیشکی لەزۆر لایەنەوە زۆر قورسـترو سـەختترە لە خـودی پیشـەی پزیشـکی. لەمیانەی وردبوونەوە لەو ڕێنمـاییە بێئەژمـارانەی سـەبارەت بە تـوێژینەوەی پزیشـکی ئەنجام دەدرێن، ڕەنگە چاوپۆشـی لەو بۆچـوونە بـکەی کە پێتـوایە تـوێژینەوەی پزیشـکی وەکـو جـگەرە وایە دەبـێ زیـان بە تەندروسـتیت بگەیەنێت؛ بەڵام لە کۆمەڵگەیەکی لیبراڵیدا لەبەرئەوەی ناکرێ تەواو قەدەغە بکرێـت، بـۆیە پێویسـتی بە ڕێکخسـتنی تەواو هەیە تـا کەمتـرین زیـانی هەبێـت. هۆکـاری ئەم چـاودێرییە قورسـە پێشـینەیەکی مێژوویـی هەیە، ئەو تـاقیکردنەوە ترسـناکانەی هەنـدێ لە پزیشـکە نازییەکـان، لە سـاڵی ١٩٤٦ ئەنجامیانـدا بـووە هـۆی ئەوەی یەکەم ڕێنمـایی نێونەتەوەیی سـەبارەت بە تـوێژینەوەی پزیشـکی کە لەسـەری کـۆکن، ئەویش یاسای نۆرنبێرگە[١٨].

---

١٨ بە ناوبـانگترین دادگـایی کردنەکـان لە مێـژووی هاوچەرخـدا، دادگاییکردنەکانی نۆرنبێرگە، یەکێکە لە پرەنسیپە بنەڕەتییەکانی ڕەوشت لە ئەزمونی مرۆڤدا، ئەم دادگایە دوای ڕووخـانی سیسـتەمی نازی لە جەنگی جیهـانیی دووەمـدا لە کۆشـکی دادی نـۆرنبێرگ، دامەزرا، تـا ئەمـرۆش ئەم دادگایی کردنانە لە بواری ئامادەکردن و جێبەجێکردنی ئەزمونە پزیشـکی و دەروونییەکـان لەسـەر مـرۆڤ بە بنەمـا دانـراوە، ئەم ئەزمـونە بە کـۆدی



**وێنەی (٢٤) لە ژمارەیەک لە ڕێنماییە پزیشکییەکاندا وادیتە پێشچاو، توێژینەوەی پزیشکی هاوشێوەی جگەرەکێشان زیان بە تەندروستی مرۆڤ دەگەیەنێت.**

---

نۆرنبێرگ Nornberg code دێتە ئەژمار. لە خوولی یەکەمی دادگایی کردنەکەدا تاوانبارانی جەنگ لە سەرکردایەتی نازییەکان لە دوای ڕووخانی کۆشکی ڕایخ درانە دادگا. لە خوولی دووەمی دادگایی کردنەکەدا ئەو دوکتۆرانە درانە دادگا، کە تاقیکردنەوەی پزیشکییان لە سەر جەستەی مرۆڤ بەبێ ویستی خۆیان ئەنجام دەدا. یەکەم دانیشتنی ئەو دادگایی کردنە لە ٢٠ نۆڤەمبەری ١٩٤٥ بوو تاکو ئۆکتۆبەری ١٩٤٦ بەردەوام بوو. لەو دادگایی کردنەدا ٢٣ کارگێڕو پزیشک بە هۆی بەشداری کردن و تێوەگلانیان لە تاوانی دژ بە مرۆڤایەتی دادگایی کران. لیوا تیلفۆرد تایلەر لە وتەیەکدا تایبەت بە دەسپێکی دادگایی کردنەکە وتی : «تاوانکاران لەم کێشەیەدا تاوانبارن بەوەی بەناوی ئالای پزیشکییەوە سەدان هەزار کەسیان کوشتووە، ئەشکەنجە داوە، ڕەفتاری وەحشیگەرییانەیان لەگەڵ کردوون» پزیشکە ئەڵمانییە نازییەکان بە بەرنامەی کوشتنی بەبەزەییانە، پلانەکانیان جێبەجێ دەکرد، ئەم کوشتنە کوشتنێکی سیستماتیک بوو، لەسەر ئەو کەسانەی شایستەی ژیان نین، لەوانە نەخۆشە ئەقڵییەکان، مرۆڤە کەمئەندامەکان. لە میانەی جەنگی دووەمی جیهانیدا، تاقیکردنەوەی پزیشکی و زانستییان لەسەر هەزاران زیندانی ئەنجامدا بە بێ ویستی خۆیان.

یاسای نۆرنبێرگ له ده خاڵ پێکهاتووه، له کۆبوونهوهی هیلسنکی بۆیهکهمجار خزێنرایه نێو پیشهی پزیشکییهوه لهلایهن سهندیکای پزیشکانی جیهانییهوه. لهساڵی ١٩٦٤ بڕیاری لهسهر درا و لهساڵی ٢٠٠٠ نوێ کرایهوه. ڕاگهیاندنی هیلسینکی وهچهی یاسایی جۆربهجۆری له فۆرمی ڕێنمایی توێژینهوه پزیشکییهکان لێکهوتهوه. ئهم ڕێنماییانه تیشکیان خسته سهر چوار مهسهلهی سهرهکیی گرنگ: ڕێزگرتن له سهربهخۆیی بهشداربووانی توێژینهوهکه؛ مهترسیی زیانهکان؛ بههاو کوالیتیی توێژینهوهکان؛ لایهنهکانی دادوهری.



وێنهی(٢٥) مرۆڤه چوست و چالاکهکان، دهتوانن به پهرهشووت سهرکێشی به ژیانی خۆیانهوه بکهن، بهڵام ڕێگهیان نادهن ههمان سهرکێشی بۆ هاوکاری توێژینهوه زانستییهکان بکهن، ئایا ئهمه دهستدرێژی نییه بۆسهر بنهماکانی ئازادیمان؟

ئەو دۆخەی لە مەترسی زیانەکانەوە وەرگیراوە تا ڕادەیەک مایەی گرنگی پێدانە. بەپێی ڕێنماییەکان پێویستە بەشداربووانی توێژینەوەکە خۆیان تووشی "کەمترین زیانی مەترسی" نەکەنەوە. تەنانەت ئەگەر ڕێنماییەکان ڕێگەیان بەوە دا کە بەشداربوو کەسێکی بەتەمەن منداڵ نییەو هەست بە مەترسییەکان دەکاو خۆبەخشانە دەیەوێ بەشداری بکات. هەرچەندە ڕوون نییە کەمترین زیان مەبەستی لە چییە، ڕەنگە لە ئاستێکی وا دانرابێ دووربێت لە مەترسییەوە، لە ژیانی ئاسایی خەڵک. بە واتایەکی تر خاڵی ڕێنماییەکان باوکساڵاریانەیە. بۆچی پێویستە بواری توێژینەوە زانستییەکان تا ڕادەیەکی باش زیانەکانی کۆنترۆڵ یان سنووردار کرابێت زیاتر لە هەر بوارێکی تری ژیانمان؟ ئێمە کڕین و فرۆشی بە ئامێرە مەترسیدارەکانەوە دەکەین و ئاساییە لامان، وەکو ئامێری خلیسکێنە، ماتۆڕسکیل، پەرەشووتی وەرزشی، هەرچەندە ئەوانەی ئەو شتانە دەکڕن مەترسی بەژیانی خۆیانەوە دەکەن.

کەواتە بۆچی پێویستە چاودێریی توێژینەوە پزیشکییەکان جیاواز بێت؟

### جووت پێوەرەکان

ئەمە تەنها یەک نموونەیە لەسەر ئەوەی ڕێکخستنی توێژینەوە پزیشکییەکان ئەو پێوەرانە دەسەپێنێ کە زۆر جیاوازە لە بوارەکانی تری ژیان. نموونەیەکی تر پەیوەندی بە بڕی ئەو زانیارییانەوە هەیە کە دەدرێتە ئەو نەخۆشانەی داوایان لێکراوە بەشداری لە پشکنینە کلینیکییەکان بکەن. بەراورد لە نێوان ئەم دوو دۆخە بکە:

**ئەزمونە کلینییەکان**

لە دۆخـــی کلینیکـــی تـــایبەت بە کلینینیکـــی نەخۆشـــی دەرەکی out patient، دوکتۆری A نەخۆشی B دەبینێ. B تووشـــی نەخۆشـــیی خەمـــۆکی بـــووە، دکتـــۆرەکە پێیباشـــە چارەســـەری نەخۆشـــیی دژە خەمـۆکیی بـۆ بنووســێ. بـۆ ئەو مەبەســـتەش چارەســـەری جیـاواز بـوونی هەیە. دکتـوری A دەرمـانی X ی بۆ دەنووسێ, لای زۆر کەس ئەو دەرمـانە ناسـراوە و بـۆ نەخۆشـی B بەسـوودە. دکتـۆری A سـوودو زیانە لاوەکییەکانی ئەم دەرمـانە بە نەخۆشـەکە ڕادەگەیەنێ. بەڵام باسی ئەو دەرمانانەی بۆ ناکات وەکو ئەلتەرنەتیـڤ بـۆ هەمان نەخۆشی بەکاردێت.

**ئەزمونە پزیشکییەکان**

ئەم شـــێوازە ئەزمـــونە، پێـــوەری هەڵســـەنگاندنی بەهـــای چارەسەری پزیشکین. بۆنموونە، گریمان چارەسەری ئێستای نەخۆشیی D دەرمانی X ە.دەرمـانێکی نوێ گەشـەی پێدراوە بە ناوی Y ، لێکۆڵینەوە سەرەتاییەکان ئاماژە بەوە دەکەن Y دەرمـانێکی کـاریگەرەو ڕەنگە لە دەرمـانی X کـاریگەرترو باشـتر بێـت. باشـترین ڕێـگە بـۆ زانینـی باشـترین دەرمـان ئەوەیە، هەنـدێ لە نەخۆشـەکان دەرمـانی X یـان پێبـدەین، هەندێکیان دەرمانی Y .ئینجا با چاودێری نەخۆشەکان بکەین بزانین کام گرووپیان باشتر دەبنەوە، ئەوانەیان دەرمـانی Y وەردەگـرن پێیـان دەڵـێن گرووپـی "ئەزمـونی" ئەو گـرووپەی دەرمـانە ئاسـاییەکە X وەردەگـرن پێیـان دەڵـێن گرووپـی "کـۆنترۆڵکراو". زۆر گـرنگە هەردوو گـرووپەکە تـاڕادەیەکی زۆر هاوشێوەبن. زۆرجار ئەنجامی ئەزمونەکە فریودەرە، بۆ

نمـوونە ئەگەر نەخۆشـەکانی نـاو گرووپێکیـان، بەشـێوەیەکی بەرچـاو تووشـی نەخۆشـی ترسـناک بـوون، زیـاتر لە گـرووپەکەی تـر. بۆئەوەی دڵنیا بیتەوە لەوەی جیاوازییەکی ئەوتـۆ لە نێـوان هەردوو گـرووپەکەدا نیـیە، بەکارهێنـانی شـێوازی هەڕەمەکیـیە بە (شـێرو خەت کـردن بە پـارەیەکی کـانزایی) بـۆ دابەشـکردنی تەواوی نەخۆشـەکان بەسـەر هەردوو گـرووپەکەدا بـۆ بەشـداری پێکردنـی ژمـارەیەکی زۆری نەخـۆش لە ئەزمـونەکەدا. باشـترین ئەزمـونی کلینیکـی، ئەزمونی هەڕەمەکیی چاودێری کراوە RCTS [19] کاتێک دەرمـانە نـوێیەکە Y لە دەرمـانە ئاسـاییەکە باشـترە، گـرووپە "کـۆنترۆڵکراو" ەکەش پێشـتر دەرمـانە ئاسـاییەکەیان وەرگرتـووە X بـۆیە ئەمجـارە دەرمـانێکی "سـاختە"یان دەدرێتـێ، ئەگەر دەرمـانی Y باشـترین دەرمـانەو لە شـێوەی 'حەب' دایە، ئەوا دەرمـانە ساختەکەش هەر لەشـێوەی هەمـان حەبـی Y دروسـت دەکرێـت، بەڵام پێکهـاتە کـاریگەرەکەی دەرمـانی Y لەو حەبەدا نیـیە، گرنگیی ئەم ئەزمـونە لێرەدایە، چونکە زۆرێک لە کەیسەکان ڕەنگە بەو حەبە ساختەیە چاک ببـنەوە، چـونکە باوەڕیـان وایە دەرمـانە کاریگەرەکەیـان خـواردووە کە Y یە. ڕەنـگە دوکتۆرەکـان لە هەڵسـەنگاندنی باشتربوونی تەندروستی نەخۆشەکەدا مەبەستیان هەبێت یان لایەندار بن. لەبەرئەوەی دەزانن کە نەخۆشەکە چارەسەرێکی کـاریگەری وەرگرتـووە، گرنـگ ئەوەیە نەخۆشـەکەو دوکتۆرەکـان نەزانن ئەم نەخۆشـانە لە گرووپی ئەزمونەکەن یان گرووپە کۆنترۆڵکراوەکەن

---

Randomize controlled trials *(RCTS)* 19

**بەراوردێکی توێژینەوەیی**

ئەزمونێکی هەڕەمەکیی بەچاو بینراو بۆ بەراوردی دووجۆر لە نەخۆشییەکانی خەمۆکی ئەنجامدەدرێ: دەرمانی X و دەرمانی Y. هەرچەندە دکتۆری A ئارەزووی بەکارهێنانی دەرمانی X ی هەیە. بەڵام لە بیرکردنەوەدا باوەڕی وا نییە کە دەرمانی X لە دەرمانی Y باشتر بێت. ئەوەی پێویستە بزانرێت کاریگەریی ڕێژەیی و کاریگەریی لاوەکیی هەر یەکە لەو دوو دەرمانەیە. بۆیە دکتۆری A قایل دەبێت بەوەی ئایا نەخۆشەکان ڕازی دەبن بەشداربن لە ئەزمونەکەدا. دکتۆری A نەخۆشی B لە کلینیکی بەشی نەخۆشە دەرەکییەکان دەبینێت، نەخۆشی B تووشی خەمۆکی بووەو خۆی کاندیدێکی باشە بەشداری لە ئەزمونەکەدا بکات. بەپێی پێوەرو یاسا ئەخلاقییەکانی توێژینەوەکە تاکو نەخۆش ملکەچی ڕێنماییەکان بێت پێویستە دکتۆری A هەوڵی ڕازی کردنی B بدات تاکو لە ئەزمونەکە بەشداربێت. پێویستە ئامانج و مەبەستی لە تاقیکردنەوەکە بە B ڕابگەیەنێ . هەروەها پێویستە باسی هەردوو چارەسەرە دەرمانییەکەشی بۆ بکات X و Y .
پێویستە B ئاگاداربێت کاتێ دەرمانەکە بەشێوەی هەڕەکی بەکار دەهێنرێت لە کاتی دەستنیشان کردنی هەر یەکێکیاندا.

لە کاتی توێژینەوەکەدا پێویستیی ڕێنماییەکان و لیژنەکانی ئەخلاقی توێژینەوەکە (بۆردی چاوخشاندنەوەی دامەزراوەیی) ئەوە دەخوازێ دکتۆری A زانیاری بداتە B سەبارەت بە هەردووجۆری دەرمانەکەو دەربارەی هەڵبژاردنی شێوازی ئەو دەرمانەی دەنووسرێ. لە دۆخی کلینیکیدا ئەم زانیارییە پێوەری یاسایی نییە. ئایا ئەم

جیاوازییە ڕەوایە؟ ئەگەر مەسەلەکە بەوشێوەیە بێت، کەواتە پێوەرەکـان جیـاوازن. ئەگەر بەو شـێوەیەش نەبێـت، ئەوا پێـوەری " جـووت پێوەرەکـان" بەکـاردێنین- واتە پێـوەرە جیاوازەکان کاتێ جیاوازییەکە ڕەوا نییە. جووت پێوەرەکـان نمـوونەی دژبەیەکین . پێمـان دەڵـێ پێویسـتە بەلای کەمەوە پێوەرێک زیاتر تاقیبکەینەوە پێوەرەکان بگۆڕین.

### توێژینەوەی پزیشکی لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا

نمـوونەی سـێیەمی پێـوەرە جیاوازەکـانە کە دەمەوێ لەم بەشـەدا تەرکیزی بخەمەسـەر. لێرەدا لە ڕووی وردبینییەوە بەراوردەکە لە نێوان توێژینەوەو نۆرمی ژیاندا نییە، تەنانەت لەنێوان تـوێژینەوەو پراکتیکە پزیشکییەکانیشـدا نییە، بەڵکو جیـــاوازیی نێــوان تــوێژینەوە لە وڵاتە دەوڵەمەنــدەکان و توێژینەوە لە وڵاتە هەژارەکاندایە.

دانـانی ئەنجـومەنی زانسـتی پزیشـکیی نێـونەتەوەیی ئەم پرەنســـیپەی لە ڕێنماییەکـــانی ١٩٩٣ دا جێگیرکـــردووە. شوێنەوارە ئەخلاقییەکان کە لە توێژینەوەکاندا ڕێکخراون لە ڕووی پرەنســیپەوە لەهەر کـوێ کـاری لەســەر بکرێـت گونجـاوە لەگەڵ ڕێزگــرتن لە شــکۆمەندیی هەر تاکێــک، سـەرەڕای ڕێزگـرتن لە کۆمەڵگە ناوخۆییەکـان و پاراسـتنی ماف و خۆشگوزەرانیی تاکەکان.

مارســیا ئەنجیــل سەرنووســەری پێشــووی گۆڤــاری پزیشکیی نیو ئینگلاند نووسیویەتی: «بابەتە مرۆییەکان، لە هەر لایەکـی جیهانـدا بێـت، پێویسـتە بە کـۆمەڵە پێـوەرێکی ئەخلاقیــی پــارێزراو بە بــێ هــیچ کەموکــوڕییەک دەورە

درابن». ئایا لێکۆڵینەوە لەم توێژینەوانە پرەنسیپە ڕەواکانی پێشێل کردووە؟ بەڵێ،ئەنجیل باوەڕی وابوو .

**خۆپاراستن لە گواستنەوەی ڤایرۆسی ئایدز HIV بۆ کۆرپەلە لە وڵاتە هەژارەکاندا**

(HIV) داڕوخانی سیستەمی بەرگری لەشە کە دەبێتە هۆی نەخۆشی AIDS ژنێکی دووگیان کە تووشبووە بە HIV ڤایرۆسەکە دەگوازێتەوە بۆ کۆرپەکەی. ئەمە پێی دەڵێن گواستنەوەی ستوونی یان ڕاستەوخۆ، چارەسەری ئافرەتی دووگیانی تووشبوو بە ڤایرۆسی سیستەمی بەرگری لەش بە (zidovudine) لەڕێگەی دەمەوە، لە کاتی سکپڕیدا یان لە ڕێگەی دەرزی لێدانەوە لە دەمار لە کاتی ژان گرتنا؛ هەروەها دۆزی تر لەو دەرمانە بۆ کۆرپە تازە لەدایکبووەکەش دەدرێت. ئەم سیستەمە زۆر گرانەو لە وڵاتێکی هەژاردا زۆردەکەوێ، سیستەمێکی باش بەلاّم هەرزان لە وڵاتە دواکەوتووە هەژارەکاندا توانای ڕێگرتن لەم نەخۆشییەی بۆ منداڵان بەشێوەیەکی بەرفراوان هەیە. بەبێ بوونی سیستەمێکی هەرزان ناتوانرێ چارەسەری گواستنەوەی ڤایرۆسی HIV بە شێوەی ستوونی بکرێت .

لە ١٩٩٧ سیستەمی ACTG 076 سیستەمێکی ستاندارد بوو لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا چونکە کاریگەرییەکی نایابی هەبوو. باوەڕ وابوو ڕەنگە سیستەمی چارەسەری هەرزانتر کە تەنها زیدۆفۆن دەگرێتە خۆی لە ڕێگەی دەمەوە ئەوەندە کاریگەر بێت.

ئەگەری هەیە دوو دیزاینی ماقوڵ لەوڵاتە هەژارەکان بەشێوەی زانستی ئەنجام بدرێت.



وێنەی(٢٦) ئایا "ڕێنماییە ڕەوشتییەکان" کە کۆنترۆڵی توێژینەوە پزیشکییەکان دەکەن، دەبنە هۆی خاوکردنەوەی پێشکەوتنی چارەسەرە کاریگەرەکان لە وڵاتە هەژارەکاندا؟

یەکەم بەراوردی هەرزانتر، سیستەمێک بە چارەسەری دەرمانی وەهمی یان ساختە placebo. دووەم بەراوردی سیستەمی هەرزانە لەگەڵ سیستەمی گرانبەها (ACTG 076). ئامانجی نەخشەی یەکەم وەڵامی ئەو پرسیارەیە: ئایا چارەسەری هەرزانبا (دەرمانی ساختە) باشترە لە هیچ؟ ئامانجی نەخشی دووەم وەڵامی ئەو پرسیارەیە ئایا سیستەمی هەرزانبا وەکو سیستەمی گرانبا کاریگەرە؟ لەم دۆخەدا ناکرێ سیستەمێکی گرانبەها وەکو چارەسەرێکی پێوەری بۆ وڵاتە هەژارەکان دابنێین، لەبەرئەوە پرسیارە

سەرەکییەکە کە پێویستە وەڵامی توێژینەوەکە بداتەوە ئەوەیە ئایا سیستەمی هەرزانبەها باشترە لە هیچ. ڕەنگە بە خێراییەکی زیاتر وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە، بەدیزاینی یەکەم دەکرێ کەمترین نەخۆش چارەسەر بکرێت (پلاسیبۆی کۆنترۆڵکراو) ئەم دیزاینە لە زۆربەی لێکۆڵینەوەکاندا بەکارهاتووە بەیارمەتی و کۆمەکی وڵاتە دەوڵەمەندەکان بەڵام لە وڵاتە هەژارەکاندا ئەم لێکۆڵینەوانەیان ئەنجام داوە.

بەگشتی ئەوە پەسەندە گروپی کۆنترۆڵکراو لە ئەزمونی چارەسەرکردندا پێویستە هەرچارەسەرێکی ستاندارد وەردەگرێ وەری بگرێت (واتە نابێ زەرەرمەند بێت کاتێ بە ڕاستی بەشداری ئەزمونەکە دەبێت بەبەراورد لەگەڵ ئەوانەی بەشدار نەبوون لە ئەزمونەکە). ئەگەر بەشداری ئەزمونێکی چارەسەریت کرد لە ئەمەریکا یان لە بەریتانیا، ئەوە ئەزمونێکە دەرمانێکی نوێ هەڵدەسەنگێنێ بەڵێن وایە بۆ فشاری خوێن بێت، پێویستە چارەسەرەکەت یان بە دەرمانە نوێیەکە بێت یان باشترین چارەسەری حاڵی حازر بێت. نابێ دەرمانە ساختە یان خراپەکە وەربگریت. چونکە ئەوە ناڕەوشتییە مادام چارەسەرێکی ئەکتیڤ و باشتر هەیە کە ناسراوە.

بەڵام ئەوە ئەخلاقی نییە لە وڵاتی سەرپەرشتیارەوە (ئەمەریکا) چارەسەر بە دەرمانی ساختە لە ئەزمونەکەدا کە سیستەمێکی هەرزانترە، بەکاربهێنرێت بۆ چارەسەرە پێوەرییەکە، چونکە سیستەمە ئەمەریکییەکە سیستەمێکی گرانبەها (ACTG 076) یە. لەسەر بنەمای یەکسانیخوازی زۆرێک لە ڕەخنەگران لەسەر ئەو باوەڕەبوون ناڕەوشتانەیە

لێکۆڵینەوەیەک ئەنجام بدرێت چارەسەری ساختەو خراپی تێدا بەکار بێت لە وڵاتە هەژارەکەدا: کاتێ جووت پێوەرەکان لەوێ جێبەجێ کراوە. بەڕاستی ئەم توێژینەوەیە پێشێلی کۆبوونەوەی ڕاگەیاندنی هیلسنکی دەکات کە تێیدا هاتووە لەڕێکخستنی توێژینەوە چارەسەرییەکاندا، پێویستە باشترین چارەسەری هەنووکەیی پێشکەش بکرێت.

بەڵام بیانووی بەهێز دژی ئەم دۆخە پێمان دەڵێ. ئەگەر ئەزمونەکە لە وڵاتێکی دەوڵەمەند ئەنجامدرا بۆ هەر نەخۆشێک هەڵەبێ، ئەوا لە ئەزمونی وەرگرتنی چارەسەری ساختە کە پێشتر



وێنەی (٢٧) هیلسنکی: ڕاگەیاندنی هیلسنکی باسی کرۆکی ئەو بنەما ڕەوشتییانە دەکات کە کۆنترۆڵی هەموو توێژینەوە پزیشکییەکان دەکات لە هەموو جیهاندا.

لەچارەسەری ئاساییدا چارەسەرێکی کاریگەریان وەرگرتووە. دیارە ئەم چارەسەرە کاریگەرە لە چارەسەرە وەهمییە ساختەکە کاریگەرتر بووە. با ئێستا چاو لە دۆخی وڵاتێکی هەژار ببڕین. لە پراکتیکی چارەسەری کلینیکی ئاساییدا نەخۆش هیچ چارەسەرێک وەرناگرێت. ژمارەیەکی زۆر لەو ئافرەتە دووگیانانەی تووشی ڤایرۆسی لە دەستدانی بەرگریی لەش بوون هیچ چاودێرییەکی تەندروستییان نییە. پرەنسیپی یاسایی لە ڕاگەیاندنی هیلسنکیدا کە تێیدا هاتووە ئەوانەی لە گرووپی کۆنترۆڵن دەبێ باشترین چارەسەری سەردەم وەرگرن، بەڵام ئەمە ڕوون نییە ئایا باشترین چارەسەر لە ئێستا واتە باشتر لە هەر شوێنێکی دونیا یان باشتر لەو وڵاتەی توێژینەوەکەی تێدا ئەنجام دەدرێت؟ ڕەخنەگران باوەڕیان وایە ئەو ئەزمونەی بە بەکارهێنانی دەرمانی ساختە لە وڵاتێکی هەژاردا سەپێنراوە، دوورە لە بەها ئەخلاقییەکانەوە و باوەڕیان وایە لیژنە بەرپرسە ئەخلاقییەکان پێویستە ڕێگەیان نەدایە دەرمانی وەهمی تاقی بکرێتەوە. هەرچۆن ڕێگە نادەن لە وڵاتێکی پێشکەوتوودا ئەنجام بدرێت. نابێت لە وڵاتدا هیچ کەسێک بەبێ ئەزمون چارەسەرێک وەربگرێت لە پێناو ڕێگری لە گواستنەوەی ستوونی (دایک بۆ کۆرپە). بۆیە نابێت هیچ کەسێک چارەسەرێکی خراپتر وەربگرێت لە "ئەزمونی کۆنترۆڵکراو" بە دەرمانی ساختەو خراپ. باشتروایە (ئەوانەی چارەسەری سیستەمی نوێ وەردەگرن) چارەسەرێکی باشتر وەربگرن (هەرچەندە تا ئەزمونەکە ئەنجام دەدرێت کەس بە ڕاستی نازانێت سیستەمی

چارەسەرە نوێیەکە بە سوودە یان نا). ئەمە نیشانەی پێچەوانەی دۆخەکەیە، چونکە *ئەگەر دەرمانێک باش بێت لە وڵاتێکی دەوڵەمەند تاقی دەکرێتەوە نەک لە وڵاتێکی هەژارنشین*، لەم دۆخەدا ئەزموونی کۆنترۆڵ کراو بە چارەسەری خراپ کە پێڕەو دەکرێت دۆخی نەخۆشەکانی زۆر خراپتر دەبێت لەوانەی دەرمانی ئاساییان وەرگرتووە، یان لە ئەزموونەکەدا نین، بە کورتی ئەوانەی لە ئەزموونی کۆنترۆڵکراودا بەشدارییان کردووە بە دەرمانی خراپ زەرەرمەند نابن ئەگەر لە وڵاتێکی هەژاردانشیندا ئەوە ڕوویدات، ڕەنگە چەند کەسێک سوودمەندبن. لە کۆتاییدا ئەم ئەرگویمێنتە بەگشتی باشترە بۆ ئەو کەسانەی لە وڵاتێکی هەژارنشیندان، لەوەی دەرمانە وەهمییەکەی تیا تاقی کراوەتەوە. ئەوانەی سوودمەند بوون لەو ئەزموونە دەبێتە هۆی ئەوەی گەشە بە دەرمانەکە بدرێت بە نرخێکی گونجاو لە داهاتوودا، تاکو ڕێگری بکرێت لە گواستنەوەی ڤایرۆسەکە بەشێوەیەکی ستوونی لە وڵاتە هەژارەکاندا. کێشەکە لەوەدایە ئەگەر ڕێگری کرا لەوەی لە ڕووی ئەخلاقییەوە نابێت ئەم دەرمانە لەو کەسانەدا بەکاربێت بەهۆی نایەکسانییەوە، ئەوا نەخۆشەکان لەو وڵاتە هەژارەدا بارودۆخیان بەرەو خراپتر دەڕوات. ئەگەر دادوەری لەوەدا بێت ئەو نەخۆشانە هیچ چارەسەرێک وەرنەگرن، لەم دۆخەدا ناچارم بڵێم چارەسەرە نادادپەروەرە ستەمکارەکەم بدەرێ. ڕەنگە بەرامبەر بەمە ئەو بژاردەیە بەکاربێنین کە چارەسەرێکی وەهمی و خراپ یان ساختە تاقیکراوە، باشتربێت لە هیچ یان تاقینەکراوە، یان چارەسەرێکی خراپ

و هەرزان باشترە لە هیچ. هەرچەندە ئەزمونێک لەژێر چاودێریدا بێت گران لەسەر نەخۆش دەکەوێت، کێ دەیدات؟ ڕەنگە لەسەر ئەو کەسانە پێویست بێت لەوڵاتە دەوڵەمەندەکان یارمەتی زیاتری وڵاتە هەژارەکان بدەن، بەڵام ڕوون نییە ئایا پێویستە ئەمە فەرز بکرێت لەسەر پێشکەشکاری پرۆژەی توێژینەوەکە، ئەوەش ڕوون نییە ئەو پارەیەی تەرخان دەکرێت بەشێوەیەکی باشتر بۆ دابینکردنی چارەسەری ڤایرۆسی کەمبوونی بەرگری لەش، گران دەکەوێ لەسەر ئەوانەی لە تاقیکردنەوەی کۆنترۆڵدان. ڕەنگە پارەی تری زیادەی پێویست بێت، بۆ نموونە بەو ڕێگەیەی کاریگەریی بەسوودی لەسەر تەندروستی ئەو کەسانە هەیە لە وڵاتە هەژارەکاندان. لە کۆتاییدا لێکۆڵینەوەی وەهمی نائەخلاقی نییە- کەس زەرەرمەند نابێ، بەڵکو بەسوودیشە ئەگەر ئەم لێکۆڵینەوەیە بۆ ئەو کەسانە ئەنجام نەدرێ کە لە وڵاتێکی هەژاردان، ئەوا زیاتر زەرەرمەند دەبن و کارەکە خراپتر دەبێت. بەپێی دەقی ڕاگەیەندراوی هیلسنکی پێویستە گروپی چاودێران باشترین چارەسەر کە لێکۆڵینەوەکەی تیا ئەنجام دەدرێت بگەیەنێتە ئەو کۆمەڵگەیە، نەک باشترین چارەسەر بۆ هەموو شوێنێکی دونیا. لێرەدا مەسەلەی ئەخلاقی سەبارەت بە ئاستی نزمی چاودێری لە وڵاتە هەژارەکاندا کێشەیەکی گەورەی دادوەرییە. بەڵام مەسەلەکە پێویستی بە چارەسەر هەیە، لەلایەن حکومەت و دامەزراوەکانەوە. پێویست ناکات ئەم نایەکسانییە قووڵە بنەڕەتییە ببێتە ڕێگر لەبەردەم ئەو توێژینەوانەی

بەشێوەیەکی گشتی بەسوودن بۆ وڵاتە هەژارەکان. من لێرەدا دوو هەڵوێستی خۆم خستە بەرچاو:

١-بەلای منەوە شتێکی زۆر دوورە لە ئەخلاقی پزیشکییەوە، ئەگەر توێژینەوەیەک لەسەر دەرمانێکی وەهمی لە وڵاتێکی هەژاردا بخرێتە ژێر چاودێرییەوە، لەکاتێکدا بیر لەوە ناکەنەوە هەمان تاقیکردنەوە لەوڵاتێکی دەوڵەمەنددا بخرێتە ژێر چاودێرییەوە. پێویستە کۆمیتەی ئەخلاقی پزیشکی ڕێگر بوایە لەوەی ئەم تاقیکردنەوە لە وڵاتێکی هەژاردا تاقیبکرێتەوە. چونکە چاودێریکردنی ئەم دەرمانە وەهمییە نائەخلاقییە. ٢- ئەوانەی خۆیان لە شوێنی فریشتە دادەنێن دەبێ هەڵوێستێکی جوامێرانەیان هەبێ بەوەی دەنگ هەڵبڕن کە ناکرێ جیاوازی بکەین لەگەڵ ئەو کەسانەی لە وڵاتە هەژارەکاندان. پێویستە هەر وەکو ئەو کەسانەی لە وڵاتە دەوڵەمەندەکاندان ڕەفتاریان لەگەڵ بکرێت. لە شوێنی دووەمدا چەقۆی سارد لە ئەرگویمێنتە ئەقڵانییەکاندا بەکاربێنن بۆ کەرتکردنی ژیریی مرۆییمان، پیشاندانی ئەوەی بەهەڵە ئاراستەکراوە. چیبکەین ئەگەر گفتوگۆکان پێچەوانەی لۆجیک بوون؟ وەڵامەکە پێویستە: بە ئەرگویمێنت و گفتوگۆکانماندا بچینەوە. بۆچی پێویستە جێگەی یەکەممان لایەنی فریشتەیی بێت؟ چونکە چارەسەر بۆ ئەو کەسانە دەدۆزێتەوە کە پلەیان لە ئێمە نزمترەو وەکو خۆمان تەماشایان دەکەین. ئەگەر وەکو بۆچوونی دووەم سەیریان بکەین ئەوا هەستێکی گوناهکارانەمان هەیە بۆ چەوساندنەوەی هەژارەکان. بەڵام ڕەخنە گرتن لە دۆخی یەکەم ڕەوایە: سەرکەوتنمان لە دانانی هەمان پێوەر بۆ

وڵاتە هەژارەکـــان هاوشـــێوەی وڵاتە دەوڵەمەنـــدەکان ئەوا بڕیـار لەســەر (وەسـتاندنی تـوێژینەوەکە دەدەیـن) زیـان بەو کەسانە دەگەیەنین کە دەمـانەوێ دادوەرانە ڕەفتاریـان لەگەڵ بکەیـن. "چەوسانەوەی هەژاران" ئەو ڕێگەیەیە لە قەیـرانەکە ڕزگارمان دەکات. ڕەنگە یەکێک سـوود لە کەسـێک ببینـێ کە هێشـتا چەوسـاوەتەوە. ڕەچـاوکردنی مەرجەکـانی قـاوە لە ئەمەریکـای خـواروو کە کۆمپانیـایەکی نێودەوڵەتی بەڕێـوەی دەبـات سـوود لەو کەسـانە دەبینێـت کە کرێیەکـی کەمیـان دەداتێ، بەبێ ئەم کارە دۆخەکە خراپتر دەبێت. بەڵام ئەگەر کۆمپانیاکە قازانجێکی باشی کرد ئەوا لەسـەر ڕەنجی شـانی کرێکارەکـان دەبێـت، بـۆیە پێویســتە قـازانجەکە وەکـو یەک دابەش بکرێت: ئەمەیە کرۆکی "بازرگـانیی دادوەرانە"یە. هەر دوو دۆخە دژبەیەکەکە کە بیـــــری لێـــــدەکەینەوە زۆر بەرتەسکن.

دۆخی یەکەم تیشکی خستۆتە سـەر مەسـەلەی دادوەری، شـتێکی ڕاسـتە، لە کێشـەیەکدا کە پەیوەنـدییەکی نزیکـی بە چەوسـاندنەوەی کەسـانی تـرەوە هەیە، بەڵام سـەپاندنی ئەو بیـــرۆکەیەی کەپێیـــوایە (پێویســـتە ئەو کـــۆنترۆڵ کـــردنە چارەســـەرێکی تەواوی پێبێـــت) و لە ســـنوورێکی تەواو جیـاوازدا پەرەی پێـدرابێت، شـتێکی هەڵەیە. دۆخـی دووەم شـــتێکی ڕاســـتە لە پیشـــاندانی ئەوەی جێبەجـێ کردنـــی پرەنسـیپەکە لە بەرژەوەنـدی ئەو کەسـانەدا نیـیە لە وڵاتە هەژارەکانـدا دەژیـن. تەنهـا لە دوو ڕوانـگەوە ئەگەری هەڵە هەیە، پێویستە لە دیدێکی فراوانترەوە بۆ مەسەلەکە بنواڕین. خاڵی دەسپێکی ئەم دیدە فراوانەش پەیوەندی بەو جیاوازییە

ئەخلاقییە سەرتاسەرییەوە هەیە کە لە نێوان وڵاتە دەوڵەمەندو هەژارەکاندا هەیە بە سەروەتو سامان و چاودێری تەندروستییەوە.

کاردانەوەی ئەم دیدە لە لێکۆڵینەوەی پزیشکیی نێونەتەوەییدا بەم شێوەیەیە: (أ) پێویستە توێژینەوکە بە شێوەیەکی گونجاوی ئەوتۆ بێت سوود بە وڵاتە هەژارەکە بگەیەنێت؛ و سوودەکەی بەشێوەیەکی یەکسان لە نێوان وڵاتە هەژارو دەوڵەمەندەکە دابەش بکرێت. (ب) دەبێ بە شێوەیەکی واقیعی بیر لەوە بکرێتەوە چۆن بە شێوەیەکی بەردەوام بە هەڵسەنگاندنێکی تەواوەوە هەوڵی بەرفراوانکردنی ئەو سوودە بدرێ کە بۆ وڵاتە هەژارەکان دەگەڕێتەوە. (ج) توێژەرەوان نەک بەرپرسیارێتی ئەو کەسانەیان لەسەر شانە کە لە وڵاتە هەژارەکاندا بەشداری لە توێژینەوەکەدا دەکەن بەڵکو بەرپرسیارن لەسەر تەواوی دانیشتوان. بۆیە پێویستمان بە ڕاوبۆچوونی تەندروستی گشتی هەیە، تەرکیزکردنە سەر بەرژەوەندیی بالای ئەوانەی بەشداری توێژینەوەکە بوون، بەبێ دانیشتوان ئەوا دەچێتە قالبی هەوڵی تاکڕەوانەوە.

هێنری فۆردی بەناوبانگ دەڵێ: "مێژوو تاڕادەیەکی زۆر یان کەم قسەی پڕوپووچە" هەروەها وتوویەتی، "ئەوەی مێژوو پشتگوێ دەخات لەسەری پێویستە جارێکی تر دووبارەی بکاتەوە" هەرچەندە من خۆم ئەوەم نەکردووە، ڕێکخستنی نێودەوڵەتیی ئێستا لەسەر توێژینەوەی پزیشکی لە گەشەکردندایە، بۆ ماوەیەکی زۆر تارمایی ڕەشی نازیزم لە ڕابردوودا ناشیرینی کردبوو. ئەم ڕێکخستنە ئێستا کاراتر

بــۆتەوە بەشــێوەیەکی ڕاڕا پشــتی بەســتووە بە: "ناکرێــت ئەوانەی بەشــداری توێژینەوەکەیــان کــردووە ڕەفتــاری خراپیــان بەرامــبەر بکرێــت". هەرچەنــدە ئەمە گرنگیــی خــۆی هەیە بەڵام جــگە لە وڵاتە هەژارەکــان لە کــوێی تــردا ئەم تــوێژینەوانە بەم خێــراییە ڕێچــکەی بنیــادنەرانەی خــۆی گرتووە.

پات بیناتاری گۆرانیبێژ دەڵێت:

«کەواتە لێـــرەدا پێویســـتە کـــاردانەوەی ئەخلاقـــی توێژینەوەکـــانی ڕابـــردوو تێپەڕێنـــین، پێویســـتە گرنگـــی بە چـــالاکیی تـــوێژینەوە نوێیەکـــان بـــدرێت بە بەرەنگـــاریبوونەوەیەکی ئەخلاقـی مەزنەوە- لەو نایەکسـانییە گەورەیەی تەندروستی جیهانی تەواو تێیدایە دەری بێنین».

# بەشی نۆیەم
# پزیشکی خێزانی سەردانی
# ماڵی لۆردەکان دەکات

*مرۆڤ ناتوانێ لە دار و تەختەی خواروخێچ هیچ شتێکی ڕاست دروست بکات.*

*(ئیمانوێل کانت)*

وەکو بینیمان ئەخلاقی پزیشکی لەگەڵ هەندێ مەسەلەی گەورەدا ڕەفتار دەکات کە پەیوەندی بە مردن و ژیانەوە هەیە. لەڕووی سروشتییەوە بێت یان دەستکردی مرۆڤ، بەرەو ڕووی هەندێ شتی نائاسایی دەبێتەوە، لەوانە جمکانەی پێکەوە نووساو، شێتبوون، وەچەخستنەوەی دەستکرد، هاوشێوەیی لێکچوونی مرۆڤ لە ڕووی جینییەوە. کاتێک تێگەیشتنت لەسەر بنەمای ئەخلاقی پزیشکی بنیاد دەنێیت، لەو مەسەلانەی دەبنە سەردێڕی هەواڵەکان، ڕەنگە تۆ پێتوابێت ئەوە دیسپلینێکە بەشێوەیەکی تایبەت گرنگی بە کارە نائاساییەکان دەدات.

پزیشکەکان پێویستیان بە بڕیارگەلێکە لە ژیانی ڕۆژانەی پزیشکیدا، بەها ئەخلاقییەکانی تیا ڕەچاو کرابێ، تەنانەت لە شتێکی ئاسایی وەکو بەرزبوونەوەی فشاری خوێندا. چی

جۆرە فشارێکی خوێن پێویستە چارەسەر بکرێت؟ دیدی زۆرێک لە خەڵک پێیوایە ئارام کردنەوەی فشاری خوێن دەبێتە هۆی ڕێگرتن لە جەڵدەیەکی مێشک. ئەوە ناهێنێ بۆ کەمکردنەوەیەکی بچووکی مەترسیی جەڵدە، خۆی تووشی کاریگەرییە لاوەکییەکانی چارەسەر بکات. کەواتە ئەو فاکتەرانە چین ناچارت دەکەن بڕیار لەسەر بەکارهێنانی چارەسەری فشاری خوێن بدەیت؟ ژمارەی ئەو کاریگەریگەرییە لاوەکییانە چەندن کە پزیشک بۆ نەخۆش ئاشکرایان دەکات، وەکو بێتاقەتی، کە نەخۆش زیاتر تووشی ئازارچەشتن دەکات، پێویستە دوکتۆر بە دەم فێرکردنەوە، ، لە پرەنسیپی کارگەیەکی دروستکردنی دەرمانی چارەسەری فشاری خوێندا، لە ڕێگەی فێربوونی پراکتیکییەوە بەرکوڵێک لە دەرمان بکات؟ ئایا ئەوە کاریگەریی لەسەر نووسینی ئەو ڕەچەتانە هەیە تا تووشی هەڵەی پزیشکی ببێت؟



وێنەی(٢٨) ئەم وێنەیە مەسەلە ڕەوشتییەکان لە پراکتیکی ڕۆژانەی ئاساییدا، بۆ هەر کارێکی پزیشکی دەخاتەڕوو.

لەم دوا بەشـەدا دەمەوێ سـەرنج بـخـەمە سـەر دوو شـت کە پزیشکانی خێزانی بەرەو ڕوویان دەبنەوە، هەمیشە کێشە ئەخلاقییەکـان لە تەکنۆلۆجیـای مۆدێرنـدا لە کێشـەیەکەوە سـەرهەڵدەدات کە لای پیشـەوەرە تەندروسـتییەکان زۆر ناسراوە: ڕاگەیاندنی پەنجاکان زۆربەکەمی دەیتوانی دوودڵی و نیگەرانیـی خێزانەکـان سـەبارەت بە پێشـهاتەکانی ئاینـدە لەچارەسەری کێشەکاندا بخاتە بەرچاو.

لەسـەدەی شـازدەیەمی زاینییـدا، مـۆنتێن ، ئەو پیـاوەی سەبارەت بە کەمتوانایی نێرینە لە فێربوونی منداڵاندا. توانی ٥٧ پەنـدی هەڵکـۆڵراو لەسـەر تەخـتە بـۆ پشـتگیریی لێکۆڵینەوەکەی بنووسـێتەوە. ئەو پەنـدانە وتە نەترسـەکانی تیرێنسـی لەخـۆ گرتبـوو، کە دەبـووایە لەسـەر سـەماعەی پزیشـکیی دوکتۆرەکاندا بە ڕوونـی بنووسـرایەتەوە: " بەلای منەوە مرۆڤایەتی شتێکی نـامۆ نییە" بێگومـان بەدەستهێنانی زەحـمەتە، بەلام ئـاواتێکە شـایانی ئەو کەسـانەیە لە دۆخە دژوارەکانـدا دەیـانەوێ بە گیـانی لێبـووردەیی، بە گیـانی خۆشەویسـتییەوە، یـارمەتیی خەڵـک بـدەن. مرۆڤـایەتی و چاکەکـاری، پاکدامانییەکی مـرۆییە. بەلام مـرۆڤە لاوازەکـان ئەو تەخـتە خـواروخێچەن- کانـت لە وتە بەنرخەکەیـدا ئامـاژەی پێداون. ئەم وتەیە لەپیشـەی تەندروسـتیدا گرنگی تایبەتیی خۆی هەیە.

*تـۆرِی ژیـان ڕیسـێکی ئاڵۆزکـاوە، باشـەو خـراپە تێکەڵە، شـانازی بە پاکـدامەنی چاکەکارییەکـانی خۆمـانەوە دەکەیـن ئەگەر بە هەڵەکـانی خۆمـان قامچیکـاری نەکرابـین. ئەو تاوانـانەی کردوومـانە تووشـی نائومێـدی دەبـن، ئەگەر ئەو چاکانەی کردوومانە مایەی ڕێزو پێزانین نەبن.*

*(شەکسپیر، هەموو شتێکی خێر بە خێر دوایی دێت، بەشی چوارەم، ٦٨-٧١)*

پێویستە دوکتۆری خێزان چی بکات کاتێ بەرەو ڕووی ئەم دۆخانە دەبێتەوە؟

**دۆخی خلەفان**

بەڕێز C تەمەنی ٧٠ ساڵە تووشی خلەفان بووە، سەرەڕای ئەوەش نەخۆشیی درێژخایەنی سییەکانی لەگەڵە (نەخۆشی درێژخایەنی گیرانی سییەکان) ژنە ٧٢ ساڵەکەی لە ماڵەوە چاودێریی دەکات. هەروەها تووشی دووبارە هەڵدانەوەی هەوکردنی سینگ بووەو دەرمانی دژەتەن وەردەگرێ، لە ماڵەوە پێویستی بە ئۆکسجینە. دەرمانەکان بەشێوەیەکی باش دژی نەخۆشییەکە کارناکەن و باری تەندروستیی لە داخزاندایە. خواردن ناخوا و شلە یان ئاوی کەم دەخواتەوە، ئەگەری هەیە ببرێتە نەخۆشخانە، لەوێ لەڕێگەی دەمارەوە دەرمانی بدرێتێ و چارەسەری سروشتی بۆ بکرێت. تاکو لەو میکرۆبە ڕزگاری دەبێت. بەڵام هێندە نابات میکرۆبێکی تر سەرهەڵدەداتەوە. نەخۆشخانە بۆ ئەو شوێنێکی ئارام نییە، بە تەواوی لەگەڵی هەڵناکاو لەگەڵ ژینگەی گۆڕاودا تووشی خەمۆکی دەبێت. لەگەڵ ئەوەشدا ژنەکەی دەڵێ پێویستە لە نەخۆشخانە بێت تاکو بتوانێت باشترین بڕی چارەسەر وەربگرێت.

بێنە پێشچاوت تۆ پزیشکی و پێتوایە بەرژەوەندیی باڵای بەڕێز C لەوەدایە لە ماڵ بمێنێتەوەو پشوو بدات ڕەنگە بەمزوانە بمرێت، بەڵام لەوانەشە بە هەرجۆرێک بێت چەند مانگێک بژێت. بە بۆنەی خرفبوونەکەیەوە ژیانی ئەوەندەی

تر تووشی تەنگژە بووە، بەبەراورد لەگەڵ نەخۆشییەکەی، مانەوەی بۆ چەند مانگێکی تر هێندە سوودی نییە، بەتایبەتی بە تێڕوانین لەو تەنگژەیەی بەهۆی نەخۆشخانەوە دووچاری دەبێت.



وێنەی(٢٩) دۆخی ماڵەوە یان نەخۆشخانە،
کێ بڕیاردەرە؟ وە چۆن بڕیار دەدرێت؟

تۆ پێتوایە باشترین شت بۆ ئەو مانەوەیەتی لە ماڵەوە، ژنەکەی دەیەوێ لە نەخۆشخانە بێت. تۆ بۆ کوێ دەڕۆیت؟
لەم دۆخەدا جیاوازیی هاوبەش هەیە.

## جیاوازی ١

ژنەکەی بەڕێز C هاوڕای تۆیە لەوەی لە ماڵ بمێنێتەوە ، بەڵام کچەکەیان کە لە نزیکییەوە دەژی، سوورە لەسەر ئەوەی داخڵی نەخۆشخانە بکرێت تا باشترین هەلی بۆ برەخسێ تا لەو زنجیرە هەوکردنەی تووشی سییەکانی بووەو دەبێت، ڕزگاری بێت. بەڕێز C ڕەنگە قایل بێت بە قسەی کچەکەی یان لەوانەیە دڵتەنگ بێت.

**جیاوازی ٢**

تۆ دکتۆرەکەی، باوەڕ وایە ئەگەر بچێت بۆ نەخۆشخانە ئیتر ئاستی تەندروستی دەگەڕێتەوە بۆ ماوەی ساڵێک یان زیاتر دەژێت، تۆ بڕیار لەسەر چارەنووسی دەدەیت، هەرچەندە بەهۆی خرفبوونەکەیەوە چاکبوونەوەی سنووردارە، لەگەڵ ئەوەشدا بەختەوەر دەبێت، ئەمە بەشێکی مەسەلەکەیە، چونکە هاوسەرەکەی لەگەڵ ئەوەی باش خزمەتی دەکات بەڵام تۆ پێتوایە باشتر وایە بچێتە نەخۆشخانە بەڵام ئەو نایەوێ لە ماڵ دوورکەوێتەوە. ئەو دەیەوێت خۆی چاودێری بکات، تەنانەت ئەگەر بە زوویی بمرێت. ڕەنگە خۆیشی ئەوەی ویستبێت.

پێویستە چۆن لە مەسەلەکە وردبیتەوە سەبارەت بەوەی لەم دۆخانەدا پێویستە چی بکرێت؟ لەم کتێبەدا بە شێوەیەکی ئەقڵانی مەسەلەکەم شیکردۆتەوە، بۆ ئەم جۆرە ڕێگایە باشترین دەسپێک دیاریکردنی ئەو مەسەلانەیە کە زۆر گرنگن. بۆ نموونە، هەندێ لە کێشەکان کە ئەم دۆخە و جیاوازییەکانی دەیورووژێنێ بەمجۆرەیە:

١-ئەگەر بەڕێز C خۆی توانای دەربڕینی دیدی خۆی هەبایە و گوزارشتی لێی بکردایە. ئەمە بەشێوەیەکی بنەڕەتی پشت بە ڕادەی لاوازیی بەهۆی خرفبوونەوە دەبەستێ.

٢-ئەگەر بەڕێز C توانای بڕیاردانی نەبوو، ئەوا دەکرێ بڕیارێک بدرێت سەبارەت بەوەی لەم دۆخەدا پێویستە چی بۆ بکرێت؟

٣- بەرژەوەندی باڵای بەڕێز C لە چیدایە، ئەگەر خۆی توانای بڕیاردانی هەبایە؟ بێگومان دیدو بۆچوونی سەبارەت بەرژەوەندیی باڵای بە شێوەیەکی سروشتی دەردەبڕی، بەڵام کاتێک ئامادەگیی ئەوەی نەبێت، ئەوا پێویستە پزیشکەکە بڕیارێک بدات کە لەگەڵ بەرژەوەندیی باڵای بەڕێز C دا بگونجێت. ئەم مەسەلەیەش هەروا ئاسان نییە، ئایا مەترسیدار نییە ئەگەر بە هۆی خرفبوونەوە پزیشکەکە بڕیار لەوە بدات ژیانی بەڕێز C شایانی بەردەوامیدان نییە. سەرەنجام باشترە لە ماڵەوە پشووبداو بمێنێتەوە؟ یان مەترسییەکە پێچەوانەیە: ئەگەر پزیشکەکە هەست بەوە بکات پێویستە نەخۆشییەکەی لە ڕێگەی دژە تەنەوە چارەسەر بکرێت، و بەڕێز C لە ژیاندا بمێنێتەوە. چۆن کەسێک دەتوانێت، خاوەن لەشێکی تەندروست بێت، ئەگەر تووشی نەخۆشییەکی وەکو خرفبوون بووبێت؟

٤-پێویستە بەرژەوەندیی باڵای بەڕێز C لە لایەن پزیشکەکەوە بڕیاری لەسەر بدرێت یان پێویستە تەنها پشت بە ویستی نەخۆشەکە ببەسترێت؟

٥- ئایا خاتوو C مافی ئەوەی هەیە بڕیار لەسەر داهاتووی ژیانی بەڕێز C بدات، لەبەرئەوەی نزیکترین کەسێتی؟

٦- لە کاتی ناکۆکی لە ناو خێزانەکەدا ( وەکو ناکۆکیی نێوان بەڕێز C و کچەکەی)

پێویستە پزیشکەکە گرنگیی زیاتر بە ڕای یەک کەس بدات وەکو خاتوو C ئەگەر مەسەلەکە بەو شێوەیە بوو لە ژێر کاریگەریی چی هەلومەرجێک و چی هۆکارێک لەو هۆکارانە دەبێت؟

لیستی ئەمجۆرە مەسەلانە تەنها سەرەتای شیکردنەوەکەیە، دوای ئەوە ئەو پرسیارانە دێنە گۆڕێ سەبارەت بە چۆنێتی هاوسەنگ ڕاگرتنی تەواوی لایەنە جیاوازەکان؛ بەڵام لۆجیکی ترە بەمجۆرە شیکردنەوە دەست پێبکەین.

ئەلتەرنەتیڤی ئەم شێوە شیکردنەوانە شێوازی گفتەگۆکردنە، زۆرێک لە پزیشکان شێوازی شیکردنەوە ناگرنەبەر بەڵکو یەکسەر گفتوگۆ دەکەن. وەکو ئەوەی لە خاتوو C دەپرسن، بۆچی دەبێت بەڕێز C بڕوات بۆ نەخۆشخانە لەجیاتی ئەوەی لەماڵەوە بمێنێتەوە. ئەوەی بەلای ئەم پزیشکانەوە گرنگە، دەیانەوێ، لە پێویستییەکان، ویستەکان و دیدی ئەوانە تێبگەن کە خاوەنی کێشەکانن و کاربکەن لەپێناوی بڕیاردان بۆ ڕێگری کردن لە کێشەکان: بێگومان ڕەنگە هەمیشە بەو شێوەیە نەبێت بەڵام بە کارامەیی و ئارامگری زۆرجار سەرکەوتن بە دەستدێت. بە واتایەکی تر، ئەم ڕێگایە لە وتوویژکردن لە نێوان کەسە سەرەکییەکاندا. ڕێگەیەکە زۆربەمان لە ژیانی ڕۆژانەماندا بەکاری دێنین. ئا ئەوە ژمارەی ئەو خێزانانەیە بۆ دوای نیوەڕۆی پشووی یەکشەمە دەبێ لە ڕێگەی وتوویژەوە چی بکەن.

لە بەکارهێنانی ڕێگەی شیکاری و ڕێگەی گفتوگۆکردندا بۆ گەیشتن بە بڕیاری ڕاستەقینە، پێویستە لە هەردوو دۆخەکەدا تێکەڵەیەک لە شیکردنەوەو گفتوگۆ بەکاربهێنرێت. بەڵام بە دیدی جیاواز لە یەکتری، گفتوگۆکردن دیدی خۆی هەیە سەبارەت بە ئەخلاقە پزیشکییەکان، من لەم کتێبەدا

لەهـیچ شـوێنێک بەجیا قسـەم لەسـەر نەکـردووە. ئەگەر بەشـێوەیەکی پـانۆرامیی بەرفـرەوان دۆخـی خـۆم بـخەمە پێشـچاو زۆربەی ئەم کتێـبە ڕەوشـتی پزیشـکی وەکـو مەسەلەیەکی ڕەوا دەبینێ، پێویستە لە ڕێگەی بیرکردنەوەی لۆجیکیـانەوە کـاری لەسـەر بکرێـت، ئەو بیرکـردنەوەیەش هێنـدە ئـاڵۆزە تـاکە ڕێگەیەکـیش بـۆ جێبەجـێ کردنـی شـک نابەین. کێشە جیاوازەکان پێویستیان بە کەرەستەی جیاواز هەیە، پێویستیان بە پرۆژەی تاکگەرایی جیاواز هەیە: کارەکە لای تاکەکـانە بـۆئەوەی بڕیـار لەسـەر ئەو شـتە بـدەن کە ئەنجامی ڕاسـت بەدەسـت دێنێت. ڕێگەی گفتوگۆ وایدەبینێ ڕەوشتە پزیشـکییەکان ، -لە ڕاسـتیدا ڕەوشـت بەشـێوەیەکی گشتی- لە بنەڕەتدا پرۆسەی کارلێکی نێوان خەڵکە.

ئەو ڕێگەیـانەی پێویسـتە پیشـەوەرە تەندروسـتییەکان لەگەڵ خێزانـی نەخۆشـەکاندا بیگـرنەبەر زۆر ئـاڵۆزە، کاتێـک نەخۆشەکە هێشتا هەرزەکارە. لێرەدا دەمەوێ مەسـەلەیەکی باو لای پزیشکە خێزانییەکان بخەمەبەرچاو: ئەویش کێشـەی ئەو کچە ١٥ ساڵییەیە کە دووگیانە.

### کێشەی کچێکی هەرزەکار کە دووگیانە

کچێکـی پـازدە سـاڵە، لەگەڵ هـاوڕێیەکی قوتابخـانەی بەشـەرمەوە سـەردانی پزیشـکی چارەسـەری سـەرەتایی دەکـات. بەو مەبەسـتەی پزیشـکەکە یـارمەتی لە بـاربردنی کۆرپەلەکەی سکی بدات، پشـکنینەکان دەریانخست کە سـکەکەی نـزیکەی دە هەفـتەیە. دەیویسـت لە بـاری ببـات. سووربوو لەسەر ئەوەی دایکو باوکی بە کێشەکە نەزانن.

لە ڕاستیدا پزیشکی خێزان پێویستە قسەی لەگەڵ بکات، لەگەڵ بوونی ئەو کێشەیەی پەیوەندی بەوەوە هەیە ئایا پێویستە یان پێویست نییە هاوڕێکەی ئامادەبێت. بە پشتگیری کردن و نەرمییەوە کچەکە ڕازی دەکرێت دایک و باوکی لەگەڵ خۆی بێنێت تا لە مەسەلەی لەباربردنی منداڵەکەدا ئامادەی گفتوگۆکە بن. ، پزیشکەکە بەرەو ڕووی کێشەیەکی ئەخلاقی گەورە دەبێتەوە. وایدابنێین پزیشکەکە زۆر بەقووڵی دژی مەسەلەی لەباربردنە، بەڵام لە وڵاتێک کار دەکات لە ڕووی یاساییەوە لەباربردن لەم دۆخانەدا ڕەوایە. ئەگەر کچەکەو باوک و دایکی ویستیان بچنە لای دکتۆرێکی منداڵبوون بە مەبەستی لە باربردنی منداڵەکە، پزیشکەکە چیێ دەکات؟ هەوڵیدا ڕایان بگۆڕێت، لەم کاتەدا مەودای ڕازی کردنیان تا چەندە؟ یان ئەرکە ئەخلاقییەکەی ئەوەیە تەنها لە کێشەکان بڕوانێت و بڕیاردان بۆ خێزانەکە بەجێدێڵێ؟

لەپشتی ئەم بابەتەوە چەند کێشەیەکی ئاڵۆز لە کایەدایە، پەیوەندیی بە هەریەکە لە ڕەوشتی لە باربردن و ئەوەی پێویستە پزیشکەکان ئەنجامی بدەن کاتێک بەرەنگاری کێشەی نێوان ئەرکی پیشەیی و ئەخلاقی شەخسی دەبنەوە.

بەڵام دەمەوێ تەرکیز بخەمە سەر هەریەکێ لەم دوو مەسەلەیە. دەمەوێ بەو چاوە لە مەسەلەکە بنوارم ئایا پێویستە بە بێ ئاگاداری دایک و باوکی کرداری لەباربردنەکە بۆ کچە دووگیانەکە ئەنجام بدرێت. یان کچەکە مافی ئەوەی هەیە کێشەکە بە نهێنی ئەنجام بدرێت؟ ئایا باوک و دایکەکە مافی ئەوەیان هەیە بە مەسەلەکە بزانن؟



وێنەی(٣٠) کچێکی ١٥ ساڵی دووگیانە، بەڵام نایەوێ دایک و باوکی بزانن.
ئایا پەردەپۆشکردنی ئەو نهێنییە لەلایەن پزیشکەکەوە ڕەوایە یان نا؟

مێژووی سوسیدادیس لە جەنگەکانی پیلۆپۆنیشیان، لە سەدەی پێنجەمی پ.ز نووسراوە، گەنجینەیەکی دۆزراوەیە بۆ ئەوانەی ئارەزووی بیرکردنەوەی پراکتیکییان هەیە. هاوڵاتییە ئەسینییەکان بە شێوەیەکی ورد پێشبینیی ئەرگویمێنتێکی لۆجیکییان کرد پێش ڕوودانی جەنگ لەگەڵ دراوسێکانیان- بەدرێژایی جیاوازییان لەگەڵ سیستەمە سیاسییەکان سەبارەت بە دیموکراسیی نوێ. هەر لایەنێک کاتی پێدرا بەبێ وەستان کێشەکەی خۆی بخاتە ڕوو. تا ئێستاش چێژ لەو نەریتە زارەکییە دەبینین لە برگە یاساییەکاندا ڕەچاوی بیرکردنەوەی ئەخلاقی کردووە کە لە دادگای باڵاوە دەرچوون.

ڕەزامەندیی پزیشکی و مافی دایک و باوکان سەبارەت بەو منداڵانەی تەمەنیان لە خوار ١٦ ساڵەوەیە، هەڵقوڵاوی بڕیارە یاساییە ئینگلیزییەکانە : لە کەیسی جیلیکدا.



وێنەی (٣١ أ) پەیکەری سۆسیدادیس.



وێنەی(٣١ب) ڕوونکردنەوەی نەریتی زارەکی بۆ بیرکردنەوەی ئەخلاقی بەشێوەیەکی جوان لە مێژووی سوسیدادیسدا، ٢٥٠٠ ساڵ پێشتر نووسراوە؛ هێشتا زیندوو و کاریگەرە لە ماڵە خانەدانەکاندا.

## کێشەی جیلیك

### ڕاستییەکان

سەرەتای ساڵی هەشتاکان، ئیدارەی حکومی بەرپرس لە خزمەتگوزاری تەندروستیی نیشتمانی(NHS)- وەزارەتی تەندروستی و ئاسایشی کۆمەڵایەتی (DHSS) ڕێنمایی بۆ پزیشکەکان نووسی سەبارەت بە خزمەتگوزاریی ڕێکخستنی خێزانی. لە ڕێنماییەکەدا دوو خاڵی گرنگ باسکرابوو.

(آ) پێویستە پزیشک بەشێوەیەکی نایاسایی ڕەفتار نەکات لە نووسینی ڕەچەتەی حەبی منداڵنەبوون بۆ کچێک تەمەنی لە ١٦ ساڵ کەمتر بێت، لەگەڵ ئەوەی پزیشکەکە لە ڕووی نیازپاکییەوە بۆ مەبەستی کاریگەریی زیانی پەیوەندییە سێکسییەکان بۆی دەنووسێ.

(ب) تەنها بە ڕەزامەندیی دایکوباوک پزیشک دەتوانێ حەبی سکنەکردن بۆ کچانی خوار تەمەنی ١٦ ساڵ بنووسێ، دەبێ هەوڵ بدات کچەکە ڕازی بکات، دایکوباوکی ئامادە بکات. لەگەڵ ئەوەشدا لە دۆخە تایبەتییەکاندا دەکرێ بێ ڕاوێژکردن بە دایکوباوکی حەبی دژە سکنەکردنی بۆ بنووسرێ ئەگەر بە پەسەند زانرا ئەو حەبەی بۆ بنووسرێت.

هاوڵاتییەکی ئاسایی، خاتوو ڤیکتوریا جیلیک، جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە نابێ حەبی دژە سکپڕی بدرێتە هیچ یەکێک لە کچەکانی بەبێ ئاگاداری و ڕەزامەندیی خۆی تا ئەو کاتەی تەمەنیان لە خوار ١٦ ساڵییەوە بێت. دەستەی خزمەتگوزاری تەندروستی نیشتمانی NHS ئەم داوایەی ڕەتکردەوە، بە بیانووی ئەوەی ئەم کێشەیە پەیوەندیی بە

بڕیـــاری کلینیکیـــی پزیشـــکەکانەوە هەیە. خـــاتوو جیلیـــک داوایەکـی یاسـایی دژی وەزارەتـی تەندروسـتی وئاسایشـی نـــاوخۆ NHSS بەرزکـــردەوە لەســـەر ئەو بنەمـــایەی ئامۆژگـاری کردنـی پزیشـکەکان بە پێـدانی وەسـیلەی دژە سکپڕی بۆ کچانی خوار تەمەن ١٦ سـاڵ، بەبێ ڕەزامەندیی دایکوباوکیان کارێکی نایاساییە.

لە کۆتاییـدا کێشــەکە لە بەرزتــرین دادگـای بەریتـانی (هاوتـای دادگـای بـاڵای ئەمەریکـی): ئەنجـومەنی لـۆردان، خـرایە بەرچـاو. پێـنج دادوەر گوێـدێری کێشــەکە بـوون و چاویـان پیاخشـاندەوە، هەریەکە لەم دادوەرانە ڕاو سـەرنجی خۆیـان دەربڕی و بە جیاجیا بڕیاریاندا، نەک هەر بڕیارانـدا بەڵکـو لۆجیکـانە مەسـەلەکەیان تـاوتوێ کـرد، بەڵام بڕیـاری کۆتـایی، پێویسـتی بە کۆبڕیـاری سـەرجەم دادوەران هەبوو. هەرچەنـدە دادوەران خـودی مەســەلەکەیان بە تەنهـا بەلاوە گرنگ نەبوو، بەڵکو بەدوای چارەسەری یاسایی ڕاستەقینەدا گەڕان: لە لایەنــی ئەخلاقیـیەوە چــی بــژاردەیەک ڕەوایە. لە کۆتاییدا بڕیارەکان نموونەی جوانی ئەخلاقییان وێناکرد.

### بڕیارەکانی دادگا

لۆرد براندۆن

لـۆرد بـرانـدۆن هـاتە ڕیـزی خـاتوو جیلـیکەوە، لە ڕاسـتیدا لەویـش زیـاتر ڕۆیشــت. پـووختەی بڕیـارەکەی ئەوەبـوو، پێـدانی وەسـیلەی دژە سـکپڕی بـۆ کچـانی خـوار تەمەن ١٦ سـاڵی، تەنـانەت بە ڕەزامەندیی بـاوک و دایکیشـیان، کـارێکی نایاسـاییە. بیانووەکەشـی بـۆ ئەوە بە کـورتی بەم شـێوەیەی لای خوارەوە بوو:

١-لێرەدا فاکتێکی یاسایی هەیە (بەپێی یاسای بنەڕەتی داڕێـــژراوی بەریتـــانی) ئەوەیە، هەر پیاوێـــک پەیوەنـــدیی سێکســـی لە گەڵ کچێـــک ببەســـتێ، تەمەنـــی لە خـــوار ١٦ ســـاڵییەوە بێـت، تەنـانەت بە ڕەزامەنـدیی کـچەکەش، ئەوا بە تاوانکار دێتە ئەژمار.

٢-ئەوەی هاندەری تاوان بێت یان ئاسانکاری بۆ تاوانبـار بکات، ئەویش تاوانکارە.

٣-ئەو کەسـەی وەسـیلەی دژە سکپڕی بـداتە کچێک یـان ڕێنیشـاندەری بێـت بـۆ پەیـداکردنی وەسـیلەی دژەسـکپڕی، ئەوا هاندەری تووشکردنییەتی بە پەیوەنـدیی سێکسـی لەگەڵ پیاوێک، ئەمەش هاوبەشکردنە لە تاوانکارییەک.

٤-هەنـدێکەس سـێودووی ئەوە دەکەن، هەنـدێ لە کچـان پەیوەندی سێکسی هەر دەکەن ئەگەر وەسیلەی دژە سکپڕی وەرگـرن یـان نـا، لەبەر ئەوە پێدانی وەسـیلەی دژە سـکپڕی هانـدەری کـچەکە نییە بۆ سێکسـکردن. بەڵام ئەمە بە تـاوان دادەنرێ لەبەر دوو هۆکار: یەکەم، ڕاستیی ئەوەی کچەکە بە دوای وەسیلەی دژەسکپڕیدا دەگەڕێت، مانـای وایە دەزانێـت، مەترســییەکە مەترســیی دووگیــان بــوونێکی نەخــوازراوە، بەمجۆرە باردۆن پێداگری دەکاو دەڵێ، کـچەکەو هـاوڕێکەی زیــاتر "ســەرقاڵی چێــژو خۆشــیی خۆیــان دەبــن" کــاتێ دژەسـکپڕی بەدەسـت دێـنن. ڕاسـتیی دووەم ئەوەیە، ئەگەر یاسا ڕێگەی بە کچەکە دا وەسیلەی دژەسکپڕی بەدەستبێنێ، بەڕەزامەنـدیی دایکوبـاوکی ئەوا ڕەنـگە تووشـی پەیوەنـدیی سێکسـیی (نایاسـایی) بێت، ئەوکـاتە لێیـان دەکێشـێتەوە، یـان ڕەنـگە دایکـو بـاوکو دکتـۆرەکەی بترسـێنێ و هەڕەشـەیان لێبکـات بۆ بەدەسـتهێنانی هەر شـتێک کە دەیەوێت. براندۆن

دەنووسێت: "باشترین وەڵام بۆ ئەمجۆرە هەڕەشانە ئەوەیە، 'چاوەڕوانبە تا دەبیتە ١٦ساڵ' ".

**لۆرد تیمپلمان**

لـۆرد تێمپلمـانیش پاڵپشـتیی جیلیکـی کـرد، هەرچەنـد بەشێوازێکی جیاواز لە لۆرد براندۆن هەڵوێستی وەرگرت. ئەو پێی وانییە، شتێکی نایاسایی بێت کچێکی خوار تەمەن ١٦ سـاڵ چارەسـەری دژەسـکپڕی وەربگرێـت بەمەرجـێ پزیشـکەکەیی و دایکوبـاوکی ڕازی بـن و پێیـانوابێ ئەمە لە بەرژەوەندیی باڵای کچەکەدایە. ئەو گوزارشتی لە بۆچوونی خـۆی کـرد بەوەی، چەنـد دۆخێـک هەیە ناتوانیـت ڕێگـری بکەیت لەوەی کچێک پەیوەندیی سێکسیی نایاسایی ئەنجام نەدات، دابینکردنـی وەسـیلەی دژەسـکپڕی بە مەبەسـتی ڕێگری کردن لە دووگیـانبوونی نەخوازراو نە هاندەرە، نە یارمەتی کردەوەی نایاساییش دەدات.

بەڵام ئەمە مانـای ئەوە نیـیە کلینـیکە پزیشـکییەکان بە ئـارەزووی خۆیـان ئەم وەسـیلانە بەبـێ ڕەزامەنـدیی دایکوباوکـان بـدەن بە کچـانی هەرزەکـار. ئەم کێشـەیە بـۆ چوار هۆکار دەگەڕێنێتەوە.

١-کچـی خـوار تەمەنـی ١٦ سـاڵی ئامـادەیی ئەوەی نیـیە ڕەزامەنـدبیت لەسـەر پێـدانی دژەسـکپڕی. ئەو دەنووسـێت: «گومـانم هەیە لەوەی کچێـک ١٦ سـاڵی تەواو نەکردبێـت، بڕیـارێکی هاوسـەنگ بـدات لە ....چـوونە نـاو پەیوەنـدی سێکسـییەوە» هۆکـاری یاسـایی بـۆ ئەم دۆخەش دەخـاتە بەرچـاوو دەڵێت، لەبەرئەوەی یاسـایی نییە پیاوێـک کـاری سێکسـی لە گەڵ کچێکی خوار تەمەنـی ١٦ سـاڵییەوە بکـات،

تەنانەت بە ڕەزامەندی کچەکەش، لەبەر ئەوە پێویستە یاسا ئەم ڕەزامەندییە پووچەڵ بکاتەوە.

٢-نابێ پزیشک ئەو مافە بەخۆی بدات، دژەسکپڕی بداتە کچێک بە بێ ڕەزامەندیی دایکوباوک، ئەگەر ئەو ڕەچەتەیە لەبەرژەوەندیی کچەکەدا بێت یاخود نا.

٣-یەکێ لە ئەرکەکانی دایکوباوک ئەوەیە پارێزگاری لە منداڵەکانیان بکەن لە پەیوەندییە نایاساییەکان، لە ڕێگەی ڕازی کردنیانەوە، یان لە ڕێگەی سەپاندنی دەسەڵاتی باوکایەتییەوە، یان لە ڕێگەی فشارخستنە سەر ئەو پیاوەی پەیوەندی بە مەسەلەکەوە هەیە تا سێکسی لەگەڵ نەکات. بەڵام ئەگەر پزیشکەکە دژەسکپڕی بۆ کچەکە دابین کرد بە بێ ڕەزامەندیی باوکودایکی ئەوا دەستوەردەداتە توانای دایکوباوکەکە، کە مافی ئەوەیان هەیە ئەرکەکانی خۆیان بەرامبەر منداڵەکانیان جێبەجێ بکەن.

٤-بە حوکمی ئەوەی باوک و دایکن، ئەوان بەرژەوەندی منداڵەکەیان باشتر دەزانن، مافی ئەوەیان هەیە ڕەزامەندییان وەربگیرێت.

*... باوک مافی ئەوەی هەیە، زیاتر سەبارەت بە کچەکەی بزانێت، پێویستە دەسەڵاتی تەواوی بەسەر کچەکەیدا هەبێت، دایکوباوک مافی ئەوەیان هەیە چاودێری کچەکەیان بکەن، ئامۆژگاری و ئاراستەی بکەن، ئەگەر توانرا ڕێگە نەدرێ پەیوەندیی سێکسی بکات تا گەورە دەبێت.*

کاتی پزیشک نهێنی کچە دەپارێزێ،«دەبێتە دەستوەردانێکی نایاسایی لەسەر مافی باوک» بۆ ئەو بڕیارە باس «لە مافی دەسەڵاتی باوک دەکرێت لەسەر

ڕەفتاری کچەکەی، لە ڕێگەی ئەزمونی هێزی کۆنترۆڵی باوک، ڕێنمایی کردن، و ئامۆژگارییەوە».

«زۆرشت لە ژیانی ڕۆژانەدا هەیە کچێک لە خوار تەمەنی ١٦ ساڵییەوە پێویستە پراکتیزەی بکات»، ئەو نووسی "بەڵام نەک پەیوەندی سێکسی" من وایدەبینم مەبەستی پراکتیزەی ئامێرێکی وەکو پیانۆ بێت.

دوو دادوەر لە بەرژەوەندی جیلیک بوون، سێ دادوەریش ڕایان جیاواز بوو.

## لۆرد فرەیزەر

لۆرد فرەیزەر لەگەڵ دوو دادوەرەکەی تر و جیلیک جیاواز بوو، لە بەرژەوەندی وەزارەتی ئاسایشی ناوخۆ دابەزی، لە گفتوگۆکەدا سێ خاڵی دەرهاویشت.

١-ئەگەر کچێک تەمەنی لە ١٦ ساڵ بەخوار بوو ئامادەیی یاسایی هەیە، لەسەر ڕەزامەندیی خۆی دژە سکپڕی و چارەسەر وەربگرێت.

٢-ئەگەر بێتو چارەسەرو ئامۆژگاری کردنی کچێک لە خوار تەمەنی ١٦ ساڵییەوە بێت لەلایەن دوکتۆرێکەوە، ئەوا دەستدرێژی کراوەتە سەر مافی ڕەزامەندیی دایکوباوکەکە.

٣-ئەگەر هاتوو پزیشکێک ئەمجۆرە چارەسەرەی دا بە کچێک لە خوار تەمەنی ١٦ ساڵییەوە، بەبێ ڕەزامەندیی دایکوباوکەکە، ئەوا بەرپرسیارێتی تاوانکارییەک هەڵدەگرێت.

فرەیزەر وایدەبینێ ئەم مەسەلانە سەبارەت بە ئامادەیی یاسایی تا ڕەزامەندیی تەواوی لەسەر وەربگیرێ ڕێک خراون. بەڵام لە ژمارەیەک لە یاساکاندا هاتووە، لەوەدا کورتی دەکاتەوە کە هیچ بنەمایەکی یاسایی نییە بۆ ئەوەی

کەسێک لەخوار تەمەنی ١٦ ساڵییەوە بۆی نەبێ ڕەزامەندی وەرگیرێت، لەسەر وەرگرتنی چارەسەری پزیشکی، تەنانەت وەرگرتنی دژە سکپڕی. سەبارەت بەو بیانووەی لۆرد تێمپلمان پێشکەشی کردووە، دەگەینە دەرەنجامێکی پێچەوانە. مشتومڕ لەسەر ئەوە دەکرێت، «ئەو کچەی تەمەنی نەگەیشتۆتە ١٦ ساڵ، دەتوانرێت ڕەزامەندیی وەربگیرێت، لەسەر پەیوەندیی سێکسی، تاکو دەرەنجامێکی یاسایی بێتە بوون، بۆئەوەی ئەو پیاوەی پەیوەندی سێکسیی لەگەڵ دەکات بە تاوانی دەستدرێژیی سێکسی، تاوانباری نەکەن (هەرچەندە هێشتا تاوانبارە بەڵام بە بڕێکی کەمتر)».

لۆرد فریزەر دەڵێ بنەمای یاسایی مافی دایک و باوک بۆ کۆنترۆڵ کردنی منداڵ لەبەرژەوەندی منداڵدا شتێکە بوونی هەیە.

لە بەرژەوەندی منداڵدایە باوک تەنها بەپێی ئەرکی باوکایەتی بەرامبەر منداڵەکە، ڕەفتار بکات... لە ڕاستیدا ڕادەی کۆنترۆڵ کردنی منداڵ لەلایەن باوکەوە، بەسەر منداڵی دیاریکراودا جێبەجێ دەبێت، ئەو منداڵانە دەگرێتەوە لە ڕووی پراکتیکییەوە جیاوازن بە جیاوازییان لەڕووی زیرەکییەوە، لەڕووی تێگەیشتنەوە. بەڕای من ڕاست نییە دادگا، ڕەچاوی ئەم ڕاستییانە نەکات. نەریتی کۆمەڵایەتی دەگۆڕێت، پێویستە یاسا ڕێزی ئەم گۆڕانکارییانە بگرێت کە گرنگیی خۆیان هەیە.

دوای وردبوونەوە لە برگە جیاوازەکانی پێشوو، لۆرد فرازەر لەسەری دەڕواو دەنووسێ:

تەنها بە دەستبەرداربوونی باوکودایک لە منداڵی خوار تەمەنی ١٦ بەس نییە بۆئەوەی کێشەکە چارەسەر بێت، لە تانەدان لە میانەی گەڕانەوە بۆ مافی دایکوباوک بەزەبر لەهەر تەمەنێکی دیاریکراودا بێت. کەس گومانی لەوەدا نییە منیش گومانم نییە لە زۆربەی کێشە گەورەکاندا باشترین دادوەر بۆ چاودێری منداڵ دایکوباوکییەتی، گومانم نییە هەرچارەسەرێک بدرێتە منداڵی خوار١٦ ساڵ، دەبێ بە ڕەزامەندیی دایکوباوک بێت، بەڵام خاتوو جیلیک دەبێ حەقی تەواوی ئەوە بدات کە مافی باوکێک ڤیتۆ بکرێت و پووچەڵ بکرێتەوە. چونکە لێرەدا لەژێر کاریگەریی هەندێ هەلومەرجدا، پزیشکێک مافی ئەوەی هەیە باشترین بڕیاربدات لەسەر چارەسەری پزیشکی و تەنانەت ئامۆژگاری کردنی ئەو کچە، کە دەبێتە هۆی خۆشگوزەرانی بۆی باشتر لە دایکو باوکی خۆی. ئەوە ئاشکرایە منداڵان لەهەردوو ڕەگەز دوودڵن لە متمانەکردن بە باوکودایکیان سەبارەت بە مەسەلە سێکسییەکان... لێرەدا هەندێ حاڵەت هەیە پزیشکەکە هەستی پێدەکات... ئەگەر ئەمە ڕاست بێت، ئاماژەیەکی بەهێزە بۆ ڕەوایەتی دان بە مافی پزیشک بۆ ئەو دۆخانەی دەچێتە خانەی بەرژەوەندیی کچەکەوە، لە ئامۆژگاری کردن سەبارەت بە کەرەستەکانی دژە سکپڕی بە کچەکە ئەگەر پێویستی بەوەکرد، بە بێ ڕەزامەندیی دایکو باوکی تەنانەت بە بێ ئاگایی ئەوان.

ئەو بۆچوونەکەی لۆرد براندۆن ڕەتدەکاتەوە، کە دەڵێ هەر پزیشکێک لە ڕێگەی یارمەتیدان و هاندانی کچێکەوە بۆ بەستنی پەیوەندیی سێکسی بە پێدانی کەرەستەی دژە سکپڕی، یان ئامۆژگاری کردنی کچان بۆ بەکارهێنانی

کەرەستەی دژە سکپڕی، لە خوار تەمەنی ١٦ ساڵییەوە، ئەوا بە پێی یاسای تاوانە سێکسییەکان لە ساڵی ١٩٥٦ تاوانێکی گەورەی ئەنجامداوە.

*ئەمەش پشت دەبەستێ، بە نییەتی پزیشکەکان، ئەم بانگەوازە گرنگییەی بەو پزیشکانە دەدات، بە راستگۆیی،کاردەکەن لە پێناو بەرژەوەندی باڵای کچەکان، من پێموانییە پزیشکێک وەکو چارەسەر دژەسکپڕی بنووسێت، یان ئامۆژگاری کچێک بکات بۆ بەکارهێنانی مادەی دژەسکپڕی، تاوانێکی کردبێت.*

**لۆرد سکارمان**

لۆرد سکارمان وایدەبینێ مەسەلەی توانای کچان بۆ بە دەستهێنانی ئەو مادانەی دژە سکپڕی زۆر وردترە لە بۆچوونەکانی لۆرد فرایزەر:

دەمەوێ بڵێم لە ڕووی یاساییەوە، مافی دایکوباوکە ڕەزامەندبن لەسەر ئەوەی کچە منداڵەکەیان کە لە ١٦ ساڵ کەمترە ئەو چارەسەرەی پزیشک دەینووسێ وەری بگرێت یان نا، ئەگەر منداڵە کچ بێت یان کوڕ ئەو توانایەی هەبوو تێبگاو هێندە زیرەک بێت مەسەلەکە تاوتوێ بکات، پێشنیاری تر بۆ ئەوە چییە؟

سکارمان لەکورتی دەیبڕێتەوەو پێیوایە، ڕێنماییەکانی تەندروستی و ئاسایشی کۆمەڵایەتی DHSS بەهەند وەربگیرێ وبەبێ ڕێگەدان بە پزیشک تا شکۆمەندیی دایکوباوکان پێشێل بکات.

سکارمان لە دوو خاڵدا هاوڕای فرایزەرەو لە یەکێکیاندا هاوڕای نییە.

**لۆرد برێج**

لـــۆرد بــــرێج مەســــەلەیەک ئەورووژێنـــــێ، لە هـــیچ بڕیارنـامەیەکی تـردا ڕاسـتەوخۆ بەوشـێوەیە نەهـاتووە. ئەو پشـــتی بە بـــڕگە یاســـاییەکانی ڕەوشـــتە کۆمەڵایەتییەکـــان بەستووە، هەروەکو لە ئەزمونی کەیسێکدا دەنووسێ:

ئەگەر بەڕێـوەبەرایەتییەکی دەوڵەت، لەیاسـا دەرچـوو... ئەوا دادگـا مـافی ئەوەی هەیە، بەوپەڕی خـۆڕاگرییەوە هەڵە یاساییەکە چاکبکاتەوە... بڕیار لەو کەیسـانە بدات کە پڕن لە هەڵە و ڕێگرن... پێویسـتە گوزارشـت لە ڕای پێشـووی بکات لە کێشـــانەی پێویســـتی بە مشـــتومڕی کـــۆمەڵایەتی و ئەخلاقییە، هیچ دەسەڵاتێک مـافی ئەوەی نییە قسـەی لەسـەر بکات.

کەواتە لـۆرد بـرێج دژی لـۆرد بـرادۆنەو هـاوڕایە لەگەڵ فرایزەر و سکارمان.

DHSS کەیســەکە دەبـاتەوە، جیلیـک، ســێ بە دوو دەیدۆڕێنێ.

## تێبینی و سەرچاوەکان

**Chapter 1**

-Ice-cream stall owner, in M. Pryce Aberystwyth Mon Amour (Bloomsbury: London, 2001)

-See W. H. Auden's poem: Musée des Beaux Arts. Faber and Faber, 1979 Isaiah Berlin, The Hedgehog and the Foe (Weidenfeld & Nicolson, 1953) As written by Zadie Smith in the Guardian (London) review (1 Nov. 2003), p. 6

**Chapter 2**

-Thucydides, History of the Peloponnesian War, tr. R. Warner, (Penguin: London, 1954)

-Warburton N, Thinking from A to Z, 2nd edn. (Routledge, 1996) Colin Spencer, Heretic's Feast: A History of Vegetarianism (University Press of New England, 1996)

-J. Rachels, 'Active and Passive Euthanasia', New England Journal of Medicine, 292 (1975). 78-80; reprinted in P. Singer (ed.), Applied Ethies (Oxford University Press, 1986) - for the cases of Smith and Jones

-J. Glover, Causing Death and Saving Lives (Penguin, 1977), p. 93 - for the cases of Robinson and Davies (originally from an article by P. Foot) For a detailed account of the Cox case, see I. Kennedy and A. Grubh. Medical Law, 3rd edn. (Butterworths, 2000)

**Chapter 3**

-J.S. Mill on Bentham in London and Westrminster Reviere, 1838; reprinted in Dissertations and Discussions I, 1859

-Tony Bullimore's account of his rescue is given in Saved (Time Warner Books, 1997).

Calculating the cost of the rescue is not at all straightförward, as Bullimore himself discusses (p. 293). One could put a price on all the person-hours, the airplane, and ship usage. This would probably come to several million pounds. Alternatively you might argue that all the personnel would have been paid anyway – so the only extra cost was the wear and tear on the planes and ships. Or you could say that the rescue was useful training and cost-free. In many situations the cost estimation of health care nteirventions are similarly open to enormous variation depending on what is ineluded in the calculation.

**Chapter 4**

-Laurence Sterne, The Life and Opinions of Tristram Shandy,

-Gentleman (1760; Everyman Library), chs. 2 and 1 The Human Fertilisation and Embryology Act, section 13(5) I. Kennedy and A. Grubb, Medical Law (3rd edn. Butterworths, 2000), PP. 1272-3

Montesquieu said that 'Men should be mourned at their birth, and not at their death'

-D. Parfit, Reasons and Persons (Oxford University Press, 1984), ch. 16

**Chapter 5**

- J.L. Borges, 'The Art of Verbal Abuse', tr. S. J. Levine, The Total Library ed. by E. Weinberger (Viking: London and New York, 1999)
- J. Rawls, A Theary of Jistice (Oxford University Press, 1972)

Flew, An Introxduction to Western Philosophy (Thames and Hudson, 1989)

- R. Gillon, Philosophical Medical Ethics (Wiley & Son, 1986)

-G. Priest, Logic:A Very Short Introduction (Oxford University Press. 2000)

**Chapter 6**

-N. Gogol 'Diary of a Madman', 1835 tr. C. English Plays and Petersburg Tales (Oxford University Press, 1995) The discussion on protecting society from dangerous people owes a great deal to Harriet Mather who developed many of these ideas in the course of her studies as a medical student.

-L. Reznek, The Nature of Disease (Routledge & Kegan Paul, 1987)B v Croydon District Health Authority (1994) 22 BMLR 13

**Chapter 7**

M Montaigne, 'On the Resemblance of Children to their Fathers', The Complete Essays tr. M. A. Screech (Allen Lane, The Penguin Press, 1991)

- M. Parker and A. Lucassen, Lancet, 357 (2001), 1033-5, for the cases concerning paternity
President's Commission on the Ethical Issues of Genetic Testing Am Med News 26 (1983) p. 25
Institute of Medicine, Committee on Assessing Genetic Risks, Assessing Genetic Risks (National Academy Press, 1994), p. 276
-D. C. Wertz, J. C. Fletcher, and J. J. Mulvihill, 'Medical Geneticists Confront Ethical Dilemmas: Cross-Cultural Comparisons among 18 Nations', American Journal of Human Genetics, 46 (1990), 1200-13 General Medical Council 2000 Confidentiality: Protecting and Providing Information www.gmc-uk.org
-M. Parker and A. Lucassen, 'Genetie Information: A Joint Account?', BMJ (in press)

**Chapter 8**

-C. Dickens A Christmas Carol, 1843
-T Hope and J. McMillan, Challenge Studies of Human Volunteers: Ethical Issues'. Journal of Medical Ethics 30 (2004) p. 110-l16, for standard of minimal harm'
1. Chalmers and R. I. Lindley, Double Standards on Informed Consent to Treatment' in L. Doyal and J. S. Tobias (eds.), Informed Consent in Medical Research (BMJ Books, 2001), pp. 266-76
Council for International Organizations of Medical Sciences (CIOMS) in collaboration with the World

Health Organization (WHO) Geneva,y International Ethical Guidelines for Biomedical Research Involving Human Subjects (1993)

-The 1993 guidelines were superseded by revised guidelines in 2002

The revision was, in part, in response to the controversy following the study considered in the second part of this chapter. The members of the group who wrote the revised guidelines were unable to agree over the issues discussed. It is interesting to read the varying opinions (see website above)

- M. Angell, 'Ethical Imperialism? Ethics in International Collaborative Clinical Research', New England Journal of Medicine, 319 (1988), 1081-3

- P. Lurie and S. M. Wolf, 'Unethical Trials of Interventions to Reduce Perinatal Transmission of the Human Immunodeficiency Virus in Developing Countries', New England Journal of Medicine, 337 (1997), 853-6

A good way of following the debate on trials in poor countries is to start with the following article that is available on the BMJ website through searching the archive, Many of the key articles are available free online and can be accessed from the reference list at the end of the following article: Solomon R. Benatar and Peter A. Singer, 'A New Look at International Research Ethics', BMJ 321 (Sept. 2000), 824-6.

For an excellent discussion of exploitation see A. Wertheimer, Exploitation (Princeton University Press, 1996)

**Chapter 9**

- I. Kant, 'Idee zu einer allgemeinen Geschichte in weltbürgerlicher Absicht', tr. I. Berlin, in The Crooked Timber of Humanity (Fontana Press, 1991)

پراکتیزەکردنی مەرگی ئاسان، ڕێک پێچەوانەی ئەو نەریتەیە، لەکۆنەوە ڕێزی لێگیراوە:" مەکوژە، کوشتن گوناهە". بەڵام لەژێر قورسایی هەندێ هەلومەرجدا، کوشتنی بە بەزەیی بەپێی دوو پرەنسیپی مۆراڵی، لەپیشەی پزیشکیدا ڕێزی لێگیراوە: ئەو دوو پرەنسیپەش، سەربەخۆیی بڕیاردانی نەخۆش، لەگەڵ لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندییە باڵاکانی نەخۆشەکەیە. دەکرێ مردن باشترین بژاردەبێت بۆ نەخۆش؟ من باوەڕم وایە بەڵێ دەبێت. دادگاکان باوەڕیان وایە دەبێت، پزیشک و پەرستارەکان باوەڕیان وایە دەبێت، کەسە نزیکەکان باوەڕیان وایە دەبێت. لە بواری چاودێریی تەندروستیدا هەمیشە ئەم پرسیارە بەهێمنی دەکرێت، کاتێک دەردی نەخۆشێک بێ دەرمانە، نەخۆشەکە لەقۆناغێکدایە ڕۆژێک یان دوو ڕۆژی تر دەمرێ، بەڵام لە ڕێگەی چارەسەری بەهێزەوە وایان لێکردووە چەند هەفتەیەک زیاتر بژی، بەتایبەتی ئەو نەخۆشانەی تووشی ژاراوی بوونی کیمیایی خوێن، یان نەخۆشییە کوشندەکان بوون. چارەسەری دژەتەنەکان یان پێدانی کانزاو شلەمەنی لەڕێگەی دەمارەوە هەرچەندە کاریگەریی لەسەر نەخۆشییەکە دەبێت، بەڵام ناتوانێ تەشەنەکردنی نەخۆشییە بنەڕەتییەکە بوەستێنێ. زۆرجار هەموو ئەوانەی گرنگیی بە چارەسەری نەخۆشەکە دەدەن پێیانوایە لە بەرژەوەندی نەخۆشەکەدایە ئێستا بمرێ، باشترە لەوەی لە ڕێگەی چارەسەرەوە دوو هەفتەیەک تەمەنی درێژبکرێتەوە.




**دەزگای ڕۆشنبیریی جەمال عیرفان**
**لەسەر ئەرکی (د. تەها ڕەسووڵ) چاپکراوە**

**2022**